دەستەی ڕاوێژکاران

حسێن عارف

ڕەووف بێگەرد

ڕێبین ئەحمەد هەردی

سەرپەرشتی گشتی

شێرکۆ بێکەس

بەڕێوەبەری ڕۆڤار

دڵشاد عەبدوڵڵا

کارگێڕ

تاهیر صالح سعید

عوسمان شەیدا

ئاکۆ کەریم مەعروف

سەرپەرشتیاری هونەری

قادر میرخان

مۆنتاجی کۆمپیوتەر

ئاسۆ سعید




(جەمال عیرفان) لە لای ڕاستەوە دووەمی ریزی پشتەوە

## ژمارەی داهاتوو تایبەتە

# بۆ مەلا عبدالکریمی مدرس


(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیریە

هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوومانگ جارێك

دەری دەکات

ناونیشان

سلێمانی -فولکەی یەکگرتن -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم/

ڕۆڤار

ت / 20690-29609

لەدەرەوەی کوردستان

سەنتەری سەرچنار

Tel: 0044162846008 Fax: 00441628477660

چاپخانە : ئۆفسیتی دلیر




**دلشاد حمە ئەمین**

-سالی 1979 لە سیوەیل لە دایك بووە.

-پەیمانگای هونەرە جوانەکانی تەواو کردووە.

-ئیستا خویندکاری کۆلیجی هونەرە لە سلیمانی.

-مادەی بەکارهاتوو لە ئیشەکانی ئەم ژمارەیەی (ڕۆڤار)

قەلەم و جاف و بەرگ بۆیەی ئاوی.

# ڕووناکبیرو سیاسەتمەداری کورد جەمال عیرفان

سیامەند

لە پاش کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان و رووخانی دەوڵەتی عوسمانی، دەستە دەستە ئەو ئەفسەرو کاربەدەستانەی کە خەڵکی شاری سلێمانی و دەوروبەری بوون و لە دەوڵەتی عوسمانیدا پلەو پایەی جۆربەجۆریان هەبوو، روویان کردەوە زێدی خۆیان (شاری سلێمانی). ئەوانەی زۆربەیان لەو رۆشنبیرو سیاسەتمەدارانەی کورد بوون کە لە کۆمەڵەو رێکخراوە سیاسی و رۆشنبیرییەکانی[1] ئەو دەم دا چالاکییان نواندبوو. لەبەرئەوە هەریەکەیان بە پێی ئەزموون و لێهاتوویی خۆی ئاگای لە باری رۆشنبیری و سیاسی و گۆڕانکارییەکانی ئەو دەمی ناوچەکەو جیهان هەبوو.

ئەم دەستە رووناکبیرانە لە سەرەتای ساڵانی بیستدا، بزووتنەوەیەکی رۆشنبیری و سیاسییان بەرپا کردو بیروباوڕی ئازادیخوازی و پێشکەوتنخوازییان بڵاودەکردەوە.



ئەگەرچی هەمووشیان بیروبۆچوونیان وەك یەك نەبوو، بەڵام لایەنی کەم لەسەر ئەوە کۆك بوون کە هەرچی زیاتر لە پێناو هۆشیارکردنەوەی خەڵکی کوردستاندا کاربکەن و دژ بە سیاسەتەکانی ئیمپریالیستی بەریتانیاو حکومەتی تورکیای کەمالی و کۆنەپەرستانی کورد تێبکۆشن.

لەنێو ئەم دەستە رووناکبیرانەدا (جەمال بەگی عیرفان) لە هەمووان تێگەیشتووترو چالاك تر بوو، کە هەر لەو سەروەختەدا بەپێی پلان و نەخشەیەکی داڕێژراو (تیرۆر) کراو لەوساکەوە هەتاکو ئێستا بە گوم ناوی ماوەتەوە ئاشکرا نەکراوە کە بە نەخشەو پلانی کام لایەن تیرۆر کرا؟!..

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵم داوە سەرەتا (بە کورتی) تیشکێك بخەمە سەر لایەنەکانی ژیانی جەمال عیرفان و پاشان ئاماژەم بۆ ئەو بیرورِا جیاجیایانە کردووە کە سەبارەت بە کوژرانی خراونەتە روو، بەو ئومێدەی لە داهاتوودا رۆشنایی زیاتر بخەینە سەر لایەنەکانی ژیانی و بە تێروتەسەلی لێی بکۆڵینەوە.

جەمال بەگی عیرفان کورِی مەلا عەبدوڵلای عیرفانی کورِی مەلا رەسووڵی کاژاوییە[1] ساڵی 1881 لە گەڕەکی کانیئاسکان، لە کۆشی خێزانێکی ناسراوی شاری سلێمانیدا چاوی پشکوتووە.

جەمال عیرفان دوو براو چوار خوشکی هەبوو. ئەحمەد کەمال و عەلی عیرفانی شاعیرو نووسەر برای بوون، خۆی برا گەورەیان بوو نائیلەو حفصەو کامیلەو حەبیبە خوشکی بوون. دایکی ناوی ئامینە بوو، بە بنەچە رەواندزی و نەوەی پاشا کۆرەی رەواندز بوو[2].

لە تەمەنی حەوت ساڵیدا سەرەتا لای عیرفان ئەفەندی باوکی خوێندی، پاشان ناردیانە لای خواجە ئەفەندی و چەند ساڵ لای ئەو خوێندی.

لەسەر ئەوەی شاگردێکی زیرەك و وریا بوو، خواجە ئەفەندی زۆری خۆش دەویست و زیاتر خۆی لەگەڵ خەریك دەکرد. پاشان چووە قوتابخانەی روشدییەی موڵکی و دواییش روشدییەی عەسکەری. ئنجا چووە شاری بەغداو ئامادەیی عەسکەری تەواو کرد، دوایی چووە شاری ئەستەمبووڵ و کۆلیژی عەسکەری تەواو کردو کرا بە ئەفسەر.

ساڵی 1910 لە موسڵ ژنی هێنا. خێزانەکەی ناوی خەدیجە بوو، دایکی کوردو باوکی چەرکەس بوو. کچێك و کورِێکیان بوو، کە ئەوانیش جەمیلەو عادل بوون.

ساڵی 1914 لەگەڵ ئەو لیژنەیەدا کە سنوری (ئێران–تورکیا–عیراق) ی دیاری دەکرد بەشداربوو ماوەیەکی زۆر لە گەڵیان هەڵسورِا.

ساڵی 1918 لە فەیلەقی شەشەمی سوپای عوسمانیدا، کە عەلی ئیحسان پاشا سەرکردەی بوو کرا بە (رەئیس ئەرکانی حەربیە). کاتێك کە فەیلەقەکە رەوانەی کەرکوك کرا، ئەویشماڵەکەی لە موسڵەوە گواستەوە بۆ کەرکوك.

دوای ئەوەی حکومەتی بەریتانیا عێراقی خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوەو سوپای عوسمانیی وەدەرنا، لە مانگی تشرینی دووەمی 1918دا شێخ مەحمودی حەفید کرا بە حوکمداری ناوچەی سلێمانی و مێجەر نوئێل کرا بە راوێژکاری.

لەو دەمەدا حکومەتی بەریتانیا لە ئەفسەرو سەربازەکانی سوپای عوسمانی، بە تایبەت ئەوانەی لە سلێمانی و دەوروبەری مابوونەوە، لەشکرێکی بەناوی (لیڤی)یەوە پێك هێناو (مێجەر دانلیس)ی کرد بە فەرماندەی. رەزا بەگ بە فەرماندەی پیادەو جەمال عیرفان بە فەرماندەی سوارە دانرا[3].

کاتێك شێخ مەحمود دژی حکومەتی بەریتانیا کەوتە جم و جۆڵ، مەحمود خانی دزڵی بەخۆی و چەکدارەکانیەوە هاتن بە هانای شێخەوە. ئەوە بوو رۆژی 21 مایسی 1919 لە بناری گۆیژە جەنگێکی سەخت لە نێوان چەکدارەکانی مەحمود خان و سوپای (لیڤی)دا بەرپا بوو. جەمال عیرفان و گەلێك لە سەربازەکانی (لیڤی) کشانە دواوە بەربەرەکانێتی مەحمود خانیان نەکردو پشتیوانی خۆیانیان بۆ شێخ مەحمود دەربڕی. بەڵام رەزا بەگ کەوتە شەرِەوەو شەوی 22/21/ مایس لە بناری گۆیژە گیراو پەل بەستیان کرد.

لە دوای رووداوەکەی 21ی مایس، چیدی، جەمال عیرفان بۆ کاروباری سەربازی نەگەرِایەوەو خۆی لە سوپا دزییەوە.

لە 20 حوزەیرانی 1919دا سەرلەنوێ حکومەتی بەریتانیا شاری سلێمانی و دەوروبەری خستەوە ژێر کۆنترۆڵی خۆی و شێخ مەحمودی بەدیل گرت و دوری خستەوە. ئەودەم بۆ ئەوەی کە باشتر پێ دابکوتێ و خۆی بچەسپێنێت، هەرچی کەسانی ناسراو و تێگەیشتووی سلێمانی هەبوو، بە تایبەت کۆنە ئەفسەرەکانی سوپای عوسمانی، کردنی بە کاربەدەستی خۆی و هەر یەکەیانی بە جۆرێك خەریك کرد. جەمال عیرفان کرا بە مدیر ناحیەی مەرگە[4].

چەند مانگێك لە مەرگە مایەوە. لەناو دڵ و دەروونی خەڵکی رەش و رووتی ئەو ناوەدا جێی خۆی کردەوە. هێندەی نەبرد گواسترایەوە بۆ ناو





سلێمانی و کرا به ئەندامی (مەجلیسی ئیدارەی سلێمانی)، کە وەك شورایەك وابوو کاروباری شارەکەیان ڕێك دەخست.

لەو سەروەختەدا حکومەتی بەریتانیا به تەواوی دەسەڵاتی بەسەر شاری سلێمانیدا دەشکاو هەرچی سیاسەتی ئیمپریالیستانەی خۆی بوو پیادەی دەکرد. ستەم و زۆرداری کاربەدەستانی بەریتانیا گەیشتبووە رادەیەك کە چیدیکە خەڵك نەیان دەتوانی بێدەنگ بن.

لەهەمان کاتیشدا کۆمەڵێك لە کۆنەپەرست و بە کرێگیراوەکانی تورك کە (تورك خوا) و (جل خوار)یان پێ دەوتن بەردەوام کەوتبوونە پڕوپاگەندە کردن بە قازانجی حکومەتی تورکیاو دژی ئینگلیزخواکان و دەستە رووناکبیرەکان هەڵس و کەوتیان دەکردو خەڵکیان لە دژیان هان دەدا.

لە بەرامبەر هەردوو دەستەی تورك خواو ئینگلیزخوادا کۆمەڵێك لاوی رووناکبیرو دڵسۆز لە دەوری یەك خڕ ببوونەوە بەردەوام بیرو باوەڕی ئازادیخوازی و پێشکەوتخوازییان بڵاو دەکردەوەو گیانی نیشتمانی پەروەری و نەتەوەییان لە بیرو هۆشی خەڵکدا زیندوو دەکردەوە. جەمال عیرفان لەنێو ئەو کۆمەڵە رووناکبیرەدا لە هەموویان چالاك ترو بە ئەزموون تر بوو.

لەو سەروەختەدا چەند کۆمەڵەیەکی سیاسی و ڕۆشنبیری نهێنی وەك: (کۆمەڵەی بەرزی وڵات)، کوردستان –گزنگ– فیداکارانی کورد –و کۆمەڵەی وەتەن پەروەران، دامەزرێنران و کەوتنە چالاکی[5].

جەمال عیرفان بەردەوام ڕێنوێنی لاوەکانی دەکردو شێوازی نوێی خەباتی فێردەکردن. هەر خۆشی داخوازی و داواکارییەکانیانی دادەڕشت و دەقی بەیاننامەو بانگەوازەکانی بۆ دەنووسین.

کاربەدەستانی ئینگلیز لە لایەك و تورك خواکان لە لایەکی دیکەوە سەرسام ببوون! باوەڕیان نەدەکرد لەنێو شاری سلێمانیدا کەسانی ئەوەندە وریاو بە ئاگا هەبن کە ئەو چەشنە چالاکیانە ئەنجام بدەن. نەیان دەزانی کێن و کێ رابەرییان دەکات..

لەو سەردەمەدا مێجەر سۆن لە شاری سلێمانی چاپخانەیەکی دامەزراندو دەستی کرد بە چاپ کردن و بڵاوکردنەوەی کتێب و نامیلکە بە زمانی کوردی. هەروەها رۆژنامەیەکیشی بەناوی (پێشکەوتن)ەوە دەرکرد. مەبەستی مێجەر سۆن لە ئەنجام دانی ئەو چەشنە کارە ئەوە بوو کە سەرنجی خەڵکی سلێمانی و ناوچەکە بەلای حکومەتی بەریتانیادا رایکێشێت.

مێجەر سۆن گەلێك شاعیرو نووسەری لە دەوری رۆژنامەی پێشکەوتن کۆکردەوە. زۆربەی ئەو نووسەرو شاعیرانە ئەو هەلەیان قۆستەوەو بە مەبەستی هۆشیارکردنەوەی خەڵکی کوردستان لەسەر لاپەڕەکانی پێشکەوتن گەلێك وتارو بابەتی بەنرخیان بڵاودەکردەوە.

جەمال عیرفان لە دەرکردنی رۆژنامەی پێشکەوتندا رۆڵێکی باشی بینی و چەندین وتارو لێکۆڵینەوەی بڵاوکردەوە. بۆ وێنە لە ژمارەکانی (64، 65، 68، 70، 81، 86، 88)دا زنجیرە وتارێکی ئابووریی دەربارەی (توتن) نووسی، کە لە وەختی خۆیدا وتوێژێکی زۆری خوڵقاند. لەو زنجیرە وتارەیدا وێڕای ئەوە کە زانیارییەکی باشی سەبارەت بە توتن لە رووی کشتوکاڵی و لە رووی پیشەسازییەوە خستبووە روو، وەرزێری کوردی لەوە بە ئاگا هێنابوو کە بەری رەنجیان کێ دەیبات و کێ کەڵکی لێ وەردەگرێت. ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە زۆربەی بازرگانە توتن کڕیارو فرۆشیارەکان بەو نووسینانە سەغڵەت بن و دەنگی ناڕەزایی بەرزبکەنەوە[6].

زۆربەی ئەو لاوە رووناکبیرانەی دژایەتی تورك خواو ئینگلیزخواکانیان دەکرد، کاریگەریی بیروباوەڕی سۆشیالیستیان بە سەرەوە بوو، بەبێ ئەوەی بە قوڵ و بەرینی لە سۆشیالیزم (وەك ئایدیۆلۆژیاو فەلسەفە) گەیشتبن.

لەو سەروەختەدا کە شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیستی لە رووسیادا بەرپا بوو، زۆربەی ئەو لاوە رووناکبیرانە لە ناوچەکانی قەفقاس و چەند شوێنی دیکەی نزیکی رووسیا ئەفسەرو کاربەدەستی حکومەتی عوسمانی بوون. هی واشیان هەبوو پێشتر لە جەنگدا بەدیل گیرابوون و لە زیندانەکانی رووسیادا بەند کرابوون، کاتێك حوکمی قەیسەری دوایی هات و بۆڵشەویك دەسەڵاتی گرتەدەست هەموویانی ئازاد کردو بەرەو وڵات و شوێنی خۆیان بەڕێی کردن. لەبەر ئەوە هەریەك بە جۆرێك کەوتبووە ژێر کاریگەریی بیروباوەڕی سۆشیالیستیەوە[7].

لە ریزی ئەم دەستە رووناکبیرەدا جەمال عیرفان بەبێ ئەوەی سنگ دەرپەڕێنێ و خوڕانێ وەك رابەروو مامۆستا وابوو.. چونکە کەسێکی تێگەیشتووترو وریاترو بە ئەزموون تر بوو.

جەمال عیرفان هەردەم هانی خەڵکی دەدا کە بە تەنگ مەسەلەی ڕەوای نەتەوەکەیانەوە بن و هەرچەند کە پێیان دەکرێت لە پێناو بووژانەوەی هەستی نەتەوایەتیدا تێبکۆشن و خزمەت بە نەتەوەکەیان بکەن بە سەختی دژایەتی ئەوانەی دەکرد کە دەبوونە کلك و نۆکەری بێگانە.. هەروەها هانی خەڵکی دەدا کە شوێن زانست پێشکەوتنخوازیی بکەن و چیدیکە لە دەریای نەزانین و بیروباوەڕی کۆنەپەرستانەدا مەلە نەکەن!

بەردەوام هانی ئافرەتی کوردی دەدا کە باوەڕیان بە خۆیان بێت و خۆ بەکەم نەزانن، ڕقی لەو داب و نەریتە کۆنەپەرستانە دەبووەوە کە زۆر ئافرەتی کورد خوویان پێوە گرتبوو (وەك پەچەبەستن).

بەردەوام ئامۆژگاری دەکردن و هانی دەدان کە زیاتر لە هەر شتێك بخوێنن و بایەخ بە زانست و بە بیروباوەڕی ئازادخوازی و پێشکەوتنخوازی بدەن.. ئا ئەمانە هەموو ببونە هۆی ئەوە کە جەمال عیرفان لەهەر ڕووناکبیرێکی دیکەی ئەو دەمە زیاتر بکەوێتە بەرچاوو بکەوێتە ناو ناوان.. بە تایبەت دەستەو تاقمە کۆنەپەرست و تورك خواکان گەلێك جار لە وتوێژەکانیاندا بە ئەنقەست ناوی جەمال عیرفانیان دەهێناو هەوڵیان دەدا ناوی بزڕێنن. ئەوانە زۆر جار وتبوویان: (جەمال فەرماسۆنە، مولحدە، بیری بۆلشەویك لەناو لاوەکاندا بڵاودەکاتەوە، دەیەوێت ئافرەت ڕووت و بەرەڵلا بن.. هەرکەس بیکوژێ دەستی سەوز ئەبێت!).

سەر لە ئێوارەی ڕۆژی سێ شەممە 12 کانونی یەکەم 1922 جەمال عیرفان لە ماڵی خۆیدا درایە بەر دەسڕێژی گوللەو بە سەختی بریندار کرا.. پاش سێ سەعات دڵی لە لێدان کەوت و بۆ دواجار چاوی لێکنا..[8].

ڕۆژی دوایی، چوار شەممە 13 کانوونی یەکەم، بەوپەڕی ڕێزو شکۆوە، بە ئامادەیی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی شاری سلێمانی و دەوروبەری لە گردی جۆگە ناشتیان.

کوژرانی جەمال عیرفان لەو هەل و مەرجەدا زۆر دەنگی دایەوەو بووە باس و خواسی هەزاران کەس.. لە کەرکوك و هەولێرو لە زۆر شوێنی دیکەش ئەو هەواڵە بڵاوبووەوەو خەڵك بە سەرسامی‌یەوە باسیان دەکرد.

لە شاری سلێمانیدا تا ماوەیەکی زۆر، لەنێو چایخانەو کۆڕو کۆبونەوەکان و لەنێو ماڵانیشدا باس هەر باسی کوژرانی جەمال عیرفان بوو.. هی وا هەبوو تا ئەوپەڕی ڕادە بۆی بەداخ بو وای دەزانی دۆستی هەرە نزیکی بە کوشت چووە.. لە کاتێکدا هی واش هەبوو خۆی بە بەختەوەرو کامەران زانیوە کە ئا بەو جۆرە مەرگی جەمال عیرفانی بینیوە!.؟.

لە هەمووان زیاتر دەستە ڕووناکبیرەکان بەم باسەوە خەریك بوون و لە هەموو کەس زیاتریش بە داخ بوون. هەندێکیان تەواو نائومێد ببوون و ترسی ئەوەیان لێ نیشتبوو کە بەو نزیکانە سەرەی یەك بە یەکیان دێت و هەموو ئاوا دەکوژرێن. هی واشیان هەبوو بیری لەوە دەکردەوە هەرکە زانرا کێ ئەم کارەی ئەنجام داوە دەبێت دەست بەجێ بکوژرێتەوەو ئەو پلان و نەخشەیەش ئاشکرا بکرێت کە بۆ کوشتنی جەمال عیرفان داڕێژراوە هەتاکو ئەو لایەنە ریسوا بکرێت.

لەوساکەوە هەتاکو ئێستا بەڵگەنامەیەك دەست نەکەوتووە کە بێ ئەملاو ئەولا و ڕێك و ڕاست دەری بخات کام دەستەو لایەن ئەم کارەیان ئەنجام داوە.. ئەوی لەبەردەست دایە تەنها بیروبۆچوون و گێڕانەوەی چەند کەسێکە، هەریەك بە جۆرێك و هەمووشیان زۆر بە کورتی لەو بارەیەوە شتێکیان نووسیوە. لەبەر ئەوە باسەکە لە سنووری چەند "گریمان"ێك تێ نەپەڕیوەو تا ئێستا بە تەواوی نەسەلمێنراوە کە ڕاستی ئەو ڕووداوە چۆن بووە!..

زۆربەی ئەو کەسانەی دەربارەی کوژرانی جەمال عیرفان نووسیویانە لەو باوەڕەدان کە بە نەخشەو پلانی تورك خواکان بە کوشت چووە، هەندێکیش لەو باوەڕەدان کە دەستەی ئینگلیز خواکان ئەو کارەیان ئەنجام دابێت، لە هەمان کاتدا هەندێك باوەڕیان وایە کە جەمال عیرفان بە دەستی چەند مەرگەیی‌یەك بە کوشت چووە؛ بیروڕایکی دیکەش هەیە کە گوایا شێخ مەحمود دەستوری داوە جەمال عیرفان بکوژرێت!..

لە حوزەیرانی 1922دا حکومەتی تورکیای کەمالی ئوزدەمیر پاشای بەهێزێکی تەیارو پڕ چەکەوە ناردە ڕەواندز. ئوزدەمیر بە نهێنی پەیوەندی بە چەند کەسێکی دەست ڕۆیشتووی نێو حکومەتەکەی شێخ مەحمودەوە کرد. پاشان وردە وردە ئەو پەیوەندییە گەورە بوو و بوو بە پەیوەندی شێخ مەحمودو حکومەتەکەی بە حکومەتی تورکیای کەمالییەوە. لەو دەمانەدا ئەگەری ئەوە لە ئارادا بوو کە هێزێکی تورك بەو نزیکانە دەگاتە سلێمانی و ڕۆژ ڕۆژی جل خوار (تورك خوا)ەکان بوو.

مامۆسا ڕەمزی قزاز سەبارەت بەو ڕۆژگارەو کوژرانی جەمال عیرفان نووسیویەتی: (لە شارا مقۆ مقۆ دەنگ و باسێکی پڕ لە مەترسی بڵاوبوەوە کە گوایا بە فیت و هاندانی ئوزەدەمیر بڕیار دراوە ئەوانەی سەر بە ئینگلیزن وە ئەو لاوانەی داوای نیشتمان پەروەری ئەکەن هەموویان بکوژن و لەناویان ببەن) (جەمال عیرفان) لەم ڕۆژانەدا کوژرا، چۆن کوژراو کێ کوشتی کەس نازانێ؟

لەبەر ئەوە ئەم دەنگ و باسە ترسناکە کارێکی گەورەی کردبووە سەر بیروباوەڕی خەڵك، ئینگلیز خواهەکان هەموو خۆیان شاردبووەوەو لە کون نەدەهاتنە دەرەوە)[9].

مامۆستا محەمەد ڕەسول هاوار نووسیویەتی: (تۆفیق وەهبی دەربارەی کوشتنی جەمال عیرفان وتی: لەو ڕۆژانەدا نەك تەنها بۆ جەمال عیرفان بەڵکو مەلا کەللە ڕەقەکان بە هاندانی تورك خواکان لیستەیەکیان کردبوو بەناوی ئەو کەسانەوە کە پێیان دەوتن (کافر یا فەرمەسۆن) کە بڕیار بوو بکوژرێن و ناوی منیش لەناو ئەو لیستەیەدا بوو بەڵام جەمال عیرفان زۆر سەرگەم بوو بۆیە کاسەکە هەمووی بە ناڕەوا لەسەری ئەوا شکایەوە)[10].

هەر لەم ڕووەوە مامۆستا ڕەفیق حیلمی نەمر لە یاداشتەکانی خۆیدا نووسیویەتی: (..تورکەکان و لاگیرەکانی تورك (سڵ)یان لە نیشتمان پەروەرەکانیش ئەکرد. بەلای تورکەوە ئەوانیش وەکو دۆستەکان و لاگیرەکانی ئینگلیز، شیاوی کوژران و لەناوبران بوون، لەبەر ئەمە هەرچەندە من بەش بە حاڵی خۆم باوەڕیشم نەئەکرد، بەڵام لەناو شارا لەم ڕۆژانەدا دەنگێکی گرنگ و سامناك بڵاوکرایەوە، ئەیان وت: بە فیت و هاندانی دەستەی ئوزدەمیر، بڕیاری ئەوە دراوە کە دۆستەکانی ئیگلیزو لاوە نیشتمان پەروەرەکانی کورد بکوژرێن و لەناوببرێن. (جەمال عیرفان)یش لەم ڕۆژانەدا کوژرا. لەبەر ئەمە، دەنگەکە کارێکی تەواوی کردبووە سەر بیری خەڵك.. ئەم کوژراوانە لەو ڕۆژەدا بوو بە هۆی ئەوە کە زۆربەی ئەهالی ئەو دەنگە بە ڕاست بزانن کە بڵاوکرابووەوە)[11]. شارەزایەکی سەردەمی حوکمڕانییەکەی شێخ مەحمود، قامکی خستووەتە سەر هەمان ڕاو نووسیویەتی: (تورك خواکان بڕیاریان دابوو بکەونە کوشتنی چەند خوێندەوارێکی نیشتمان پەروەر، ئەوە بوو سەر لە ئێوارەیەك ئەم تاوانەیان کردو لەناو ماڵ و منداڵی خۆیدا جەمال عیرفانیان کوشت. بە داخەوە ئەڵێم کاربەدەستانی حکومەتی سلێمانی هەوڵ و تەقەلایەکی بەهێزی نەخستە کارەوە بۆ دۆزینەوەی تاوانبارەکان) هەر ئەم کەسە شارەزایە پێشتر نووسیویەتی: (دانیشتوانی سلێمانی.. وەکو خۆڵی مردوویان بەسەر کرابێ ماتەمینی دایگرتبوون و پەشۆکاو بوون و کەوتبوونە دەریای خەفەتەوە، بێجگە لە مەترسی هاتنەوەی تورك خەبەری کوشتنی جەمال بەگی عیرفان ئەوەندەی تر دانیشتوانی شارەکەی سەرسام کرد هەرچەند لێیان ئەکۆڵیەوەو لێ‌ی ورد ئەبوونەوە بۆیان ساغ نەئەبووەوە لەسەر چی کوژراوە چونکە جەمال عیرفانی نەمر گەل و نیشتمانەکەی خۆش ئەویست و لەگەڵ نیشتمان پەروەرە هەڤاڵەکانی هەوڵیان ئەداو بەربەرەکانیان

ئەکرد کە دەستی ناپاك لە حکومەتە ساواکەمان دوور بخەنەوە) دوایی نووسیویەتی: (ئیتر هەڤاڵە هاوبیرەکانی جەمال عیرفانیش هەستیان کردو بۆیان روون بووەوە کە تووشی ئازار ئەبن هەندێکیان کەوتنە هەوڵدان بۆ پاراستنی خۆیان و هەندێکیشیان خۆیان لە سلێمانی دوورخستەوە.. ئەم کارەساتە خوێناوی‌یە جۆشی بە دانیشوانی شارەکە دابوو لەعنەتی ئەو مرۆڤە جانەوەرو دڕندانەیان ئەکرد کە ئەم کارەیان کرد، تاوانبارەکان لەم کارە خوێناویی‌یەی کردیان سڵەمینەوەو بۆ ئەمەی ئاشکرا نەبن وازیان لە کوشتن هێنا)[12].

مام جەلال سەبارەت بە کوژرانی جەمال عیرفان و ئەو هەل و مەرجەی تیای کوژرا نووسیویەتی: (.. لە پاش ئەوە کە شاری سلێمانی لە لایەن ئینگلیزەوە داگیر کرا.. لەنێو کوردەکاندا کەسانی وا سەریان هەڵدا کە هەواڵەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر حکومەتی سۆڤیەتیان بڵاودەکردەوە، ئەوانە بە بۆڵشەویك ناسرابون بێ ئەوەی لە راستیدا بۆڵشەویك بن و لە مارکسیزم – لینینیزم یان بیری کۆمۆنیستی تێگەیشتبن، بەڵکو دەستەیەك بوون کە زۆربەیان لەو دیلە کوردانە بوون کە بۆڵشەویك ئازادی کردن. لە نێوانیاندا رووناکبیرێك هەبوو ئەویش (جەمال عیرفان) بوو کە بە پلانی ئیستعماری بەریتانیاو کۆنەپەرستانی کورد لە شاری سلێمانی کوژرا. ئەو کوردە بۆڵشەویکانەی پڕوپاگەندەیان بۆ حوکمی سۆڤیەتی دەکرد کە بەریتانیەکانی ترساندبوو)[13].

مامۆستای نەمر "شاکر فەتاح" بەدەمی بۆی گێڕامەوەو وتی: (کاتێك جەمال عیرفان لە مەرگە مدیر ناحیە بوو، ژنی کوڕێکی باپیر ئاغای پشدەری دەتۆرێ و پەنا دەباتە بەرماڵی جەمال عیرفان. ئەویش داڵدەی دەدات و لە ماڵی خۆی دەیهێڵێتەوە. پشدەرییەکان بە چەکەوە هەڵدەکوتنە سەر ماڵی جەمال عیرفان و بە تووڕەییەوە داوای ئافرەتەکە دەکەنەوە. ئەویش لەو کردەوەیە پەست دەبێ دەچێ بە رقاو ئافرەتەکەیان ناداتەوە، زیاتر لەبەر ئەوە کە نەوەکا ئافرەتەکە بکوژن؛ ئیتر لەوەوە پشدەرییەکان رق لە جەمال عیرفان هەڵدەگرن و بۆ هەلێك دەگەڕێن تۆڵەی خۆیانی لێ بکەنەوە! پاش ماوەیەك جەمال عیرفان دەگەڕێتەوە سلێمانی و واز لە مدیر ناحیەیی دەهێنێت. پشدەرییەکان کە ئەو رقەیان لە دڵدا هەرماوە، "حەمە بچکۆلی حەمە ئاغا" و چەند کەسێکی دیکە هان دەدا کە جەمال عیرفان بکوژن. ئەوەبوو سەرەنجام لەنێو ماڵێ خۆیاندا کوشتیان..)[14].



مامۆستا رەفیق حیلمی لە یاداشتەکەیدا نووسیوویەتی (چەند رۆژێ پێش کوژرانی هاتە لام و زۆر بە ئاڵۆزاو هاتە بەرچاوم و گەلێك بەسەریا هاتم و دڵخۆشیم دایەوە. بەڵام تەواو (بێ ورە) بوو بوو، پاشان نوسیوویەتی: (ئەڵێن جەمال بەدەستی هەندێ مەرگەیی دوژمنی خۆی بە کوشت چوو)[15].

"سیسل جۆن ئیدمۆندز" کە ئەفسەرێکی ناسراوی حکومەتی بەریتانیا بوو لە عێراق سەبارەت بە کوژرانی جەمال عیرفان نوسیوویەتی: لە حوکمڕانی‌یەکەی شێخ مەحمودا لە بریتی ئەوە کە کاروبار بدرێتە دەست ئەفسەرە رووناکبیرە کوردەکان، هەرچی شێخە دواکەوتووەکان بوو ببوونە کاربەدەست و ئەفسەرەکان دوور خرابوونەوە "یەکێك لە ئەفسەرە هەرە رۆشنبیرەکان، کە لە سلێمانی دەژیا جەمال بەگ، لەسەر ئەوەی کە رەخنەی لە حوکمڕانەکەی شێخ مەحمود گرتبوو کوژرا"[16].

من خۆم رای ئەوانە بە راست تر دەزانم کە تورك خواکان بە بکوژی جەمال عیرفان دەزانن. لەو باوەڕەشدام ئۆزدەمیر پاشا کە ئەو دەمە لە رەواندزەوە چاودێری باری ناوخۆی حکومەتەکەی شێخ مەحمودی

دەکـردو ئاگــای لــە ڕووداوو گۆڕانکاریـیــەکانی شــاری ســلێمانی و دەوروبــەری بــوو دەســتی لــەم کــارە تیرۆرســتی‌یەدا هــەبووەو بــەبێ دەستووری ئەو نەکرا!

**پەراوێزەکان:**

1-مـەلا عـەبدوڵڵای عیرفـان کـە بـە عیرفـان ئەفـەندی ناسـرابوو، مامۆستایەکی شارەزاو لێهاتوو بوو. شیعرو نووسینی زۆرە بەڵام زۆری فەوتان. لە شاری سلێمانی و لە مزگەوتی "بن تەبەق" منداڵانی فێری خوێنـدەواری دەکـرد، لـە قوتابخانـەی ڕوشـدییەی موڵکیشـدا وانـەی دەوتــەوە. ئــەمین زەکــی بــەگی مێــژوو نــووس یــەکێك بــووە لــە قوتابی‌یەکانی. ساڵی 1914 کۆچی دوایی کردووە. (دەربارەی بڕوانە: تاريخ السليمانيه، محمد امين زكي، نقله الى العربيه: الملا جميل الملا احمد الروزبياني، بغداد، 1951، ص 271).

بەشـی دووەمـی ئـەم زانیارییانـەم لـە مامۆسـتا "ئەحمـەد خواجـە" وەرگرتـووە، لـە دیدارێکدا لـە ماڵی خۆیـان، لـە گـەڕەکی شـۆڕش ڕۆژی 1988/10/3.

هـەروەها مامۆسـتا "فوئـاد ڕەشـید" کـە خزمـی جـەمال عیرفانـەو جەمیلــەی کچیشــی هاوســەری بــووە، لــە دیدارێکــدا لــە ڕۆژی 1988/10/4 سەبارەت بە ژیانی جەمال عیرفان زنیاریی باشی دامێ.

3-بڕوانە: چیم دی، ئەحمەد خواجە، بەرگی یەکەم -بەشی یەکەم، بغداد، 1986، ل 25.

4-بڕوانە دەقی ئەو نامەیەی کە مەندوبی مەدەنی "گوڵد سمیث" لە 1920/7/10 سەبارەت بە کاروبـاری شـاری سـلێمانی نووسـیویەتی، دەقی نامەکە لە لایەن مامۆستا دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکرەوە لە گۆڤاری (الثقافة) ژمارە 6، ساڵی 1983، ل 131دا بڵاوکراوەتەوە.

5-دەربارەی ئەم کۆمەڵانە بڕوانە: چیم دی بەرگی یەکەم- بەشـی یەکەم، ل 61.

6-مامۆستا کـەریم مستەفا شارەزا لـە ڕۆژنامـەی هاوکـاری (ژمـارە 1189، 1990/6/25، ل5) لێکۆڵینەوەیــەکی ســەنگینی دەربــارەی وتارەکەی جەمال عیرفان بڵاوکردۆتەوە.

7-لـەم ڕووەوە بڕوانـە: كردستان و الحركة القومية الكردية، جـلال الطالباني، منشورات النور الطبعة الاولى، بغداد، 1970، ص 58-59.

8-شێخ نووری شێخ ساڵح لە ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) ژمارە 5، چوار شــەممە 1922/1/20دا بــەم جــۆرە هــەواڵی کوژرانــی جــەمال عیرفــانی بڵاوکردۆتەوە:

"ضیاعێکی گەورە لە ئەزکیاو منەوەرانی وەطەن، عیرفان زادە جەمال بەگ، شەوی چوار شەممەی ڕابردوو 13/12/ کـانوونی ئـەوەل 1338، لـە طـرف ئەشخاصی مەجهولەوە دەسرێژێکی لێکرا دوو گوللە ئیصابەتی کرد، پاشی 3 سەعات وەفاتی کرد، حەقیقەت ضیاعی ئەو زاتە گەورە بۆ کوردستان موجب تەئەثر بوو. بەناوی ئەشراف و عمومی مەملەکەتەوە لە عائیلەی محتـەرەمیان بەیانی تـەعزیت تەمـەنای تەسلیەت ئەکـەین"، (تەنـها ڕێنووسـی نووسـینەکە دەست کاری کراوە).

9-بزوتنــەوەی سیاســی و ڕۆشــنبیری کــورد، ڕەمــزی قــەزاز ســلێمانی، 1971، ل 186.

شێخ مـەحمودی قارەمـان و دەوڵەتەکـەی خـواروی کوردسـتان، محەمـەد ڕەسول هاوار، بەرگی دووهەم، ل 336.

11-یادداشت، ڕەفیق حیلمی، جزم شەشەم، بەغدا، 1958، ل 40-41.



12-بڕوانە: ڕوون کردنەوەیەك دەربارەی هـەندێك لـە باسـەکانی چیم دی، نووسینی (هـەڵۆ)، گۆڤاری بـەیان، ژمارە 5، کـانوونی دووەم 1971، ل 37-38. (وەك مامۆستا جەمال مفتی وتی وا پێدەچێت "هـەڵۆ" ناوی خواستراوی "ئەحمەد فەخری ئەمین" بێت).

13-كردستان و الحركة القومية الكردية، ص 58.

14-مامۆسـتا شـاکر فـەتاحی نـەمر چـەند ڕۆژێك بـەر لـەوەی بگیرێت، بـەو جۆرە باسی کوژرانی جەمال عیرفانی کردو وتی: جگە لەوە هـەرچی دەربارەی کوژرانی جەمال عیرفان نووسراوە ناڕاستە.

15-یادداشت، جزمی شەشەم، ل 40.

16-بڕوانە: كرد و ترك و عرب، س. جي. ادموند ترجمـه: جرجيس فتح الله، بغداد، 1971، ص 275.

یان بڕوانە:

(G. J. Edmonds. Kurds, Turks and Arabs, London 1957, p. 304).

**سەرچاوە:**

ژمارە 30ی گۆڤاری ڕێبازی خوێندکاران ساڵی 1998.

# باسی جەمال عیرفان

**له یاداشتی رەفیق حیلمیدا**

(1)

## بەش دووەمی یاداشتی ( کوردستانی عیراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود )

## نووسینی رەفیق حیلمی.

## موئتەمەری سلێمانی و بڕیاردان لەسەر مەرجەکانی ئوزدەمیر:

دوامین رۆژەکانی زستانی (922) بوو. شاری سلێمانی لەبەر سوارەی عەشایر جمەی ئەهات. له کۆڵانەکان و ناو بازاڕا لەبەر هاتوچۆکەری چەکدار رێ بەر نەئەکەوت. دیوانی شێخ مەحمودی (مەلیکی کوردستان) پڕ بوو لە گەورە گەورەکانی کوردو سەرەك عەشیرەتەکان. (نەشاطیکی سیاسی)، نهێنی و ئاشکرا لەناوا بوو. وڵاتی کورد بەرەو کارەساتێکی گرنگ و سامناك ئەچوو. بەڵام بەشی هەرە زۆری خەڵق ئاگایان له هیچ نەبوو. ماڵان و چاخانەکان وەکو ئیمڕۆ لەگەڵ گێتیـیا نەئەژیان. چونکه (رادیۆ) و (تەلەفزیۆن) نەکەوتبوە عیراقەوەو تەنانەت ناویشی نەبیسرابوو. رۆژنامەکانی بەغداش بە رێکوپێکی نەئەهات و بەدانوسقه چنگ ئەکەوت. هۆی گوێزانەوەو هاتوچۆش کەم و بێ کەڵك. ترسی رێگاکانیش، کەمێك بوو بوو بە سەربار. بە کورتی ئەوانەی لەو رۆژانەدا لە سلێمانی بوون لە عالەمێکی ترا ئەژیان و ئاگایان لە هیچ نەبوو. وەکو کورد ئەڵێ: "بێ خەبەران کەشکەك سڵاوات!".

ئا لەم رۆژانەدا بوو که له لایەن ئوزدەمیرەوە بۆ سلێمانی به فەوزیی و رەمزی و ئەحمەد تەقیـیا؛ و له لایەن شێخ مەحمودەوە بۆ رەواندن، بە سەید مەحمودی موفتی و عەبدوڵڵا ئاغای حاجی حەمە سەعید و مەجید بەگی حاجی رەسول بەگا، پەیتا پەیتا نامه سیاسییەکان و گرنگەکان ئەهات و ئەچو. گرنگترینی ئەم نامانه وەکو ئەمان بیستەوە ئەو (مەزبەتە)یە بوو، کە بۆ سەرگرتنی پێکەوە ژیانی کوردو تورك چەن (مەرج)ێکی تێ خرابوو. ئەیان ووت تا ئەم مەزبەتەیە نوسرابوو، له (دیوانی مەلیك)دا شەوها رۆژ کرابوەوە. بەڵام به ئەنجام بڕیاری هەر لەسەر درابوو و لەلایەن زۆربەی سەرەك عەشیرەت و گەورەکانی کوردەوە (ئیمزا) کرابوو و نێررابوو بۆ ئوزدەمیر. ئینجا (فەوزی) و (رەمزی) و (ئەحمەد تەقی)، لە وەڵامی ئەم (مەزبەتە)یەدا بوو کە (مەرج)ەکانی تورك و یا (هی ئوزدەمیر)یان هانیبوو و هاتبوونە سلێمانی.

له کاتێکا که هەیئەتی ناوبراو له (دیوانی مەلیك)، دابەزیبوون و مەرجەکانی تورك خرابوە ژێر باس و وردکردنەوە، لەناو شاردا، وەکو لەجێی خۆیا باسمان کردبوو دەنگێکی وا بڵاو کرایەوە که زۆر کەس له خۆیان کەوتنه شکەوە. ترسیان لێ نیشت و هەندێ کەس هەر بە تەمای ژیان نەمابوون. چەند نەفەرێکی نەفام و نەخوێندەوار ئەیانوت: (فتوا) دەرکراوە، (منەووەر)ەکان ئەکوژن، منەووەر، ئەو رۆژه بەوانه ئەوترا که خوێندەوار بوون و له تەمەنی لاوی و غویابیـیا بوون. به تایبەتی ئەو بەشەیان بەکەسانی قوتابی قوتابخانه بەرزەکانی ئیمڕۆ خوێن گەرم بوون و لافی نیشتمان پەروەرییان لێ ئەدا. به کورتی ئەو لاوانه که کورد پەروەر بوون و بەهۆی هانەهانەی چەند مامۆستاییێك و پێنج شەش (زابت)ەوە بوو بوون به رابەری خەڵق و له کوردستان بەو لاوە (پەرەستیدە)ییێکیان نەبوو، ئەوانه که له هێزی وشەو خوێنی گەرم بەولاوە چەکێکیان نەبوو و دەسمایەییێکیان شك نەئەبرد. بەڵێ! ئەمانه (منەووەر) بوون و یا منەووەریان پێ ئەوتن. بەڵام نەك بە مانای ستایش! بەڵکو به مانایێك که ناشێ بۆ ئەو جۆره لاوه بەڕێزانەو رۆڵە کوردانه بەکاربهێنرێت. چونکه مەبەستی ئەو چەن نەفەره له (منەووەر)، (بێ دین!)ەکان واتا ئەوانه بوون که دوژمنی (ئیسلام!) و (خائن!)ی تورك بوون!

ئەوانەی ئەمەیان ئەوت حەقیشیان بەدەس بوو. چونکه هەموو چەن کەسێك بوون لە دەستەی نۆکەرو دەس و پێوەندی نەفام و نەخوێندوار. بەڵام ئەوی جێی داخه ئەوەبوو: که چەن (نیوه مەلا)یێکی ووشك و بێ سەلیقه و کەم چیکڵدانەیان له دواوه بوو که له (پلەی زانستی)شا زۆر له ژوور ئەوانەوه نەبوون.

ئەوی سەیره ئەوەیه که دەستەی (مەلا درۆزنە)[1] و نۆکەرو دەس و پێوەند، هەر (منەووەر)یان نەگرتبوو بە دەمەوه. ئەم دەسته دەهۆڵ ژەنە کەوتبوونە (وێزە)ی ئەوانەشەوه که به (نۆکەر)ی ئینگلیزو یا به (جاسووس)یان دائەنان. خۆزگه هەر لەگەڵ ئەمانەش خەریکبوونایە و ئەمانەیان رسوابکردایه.

**1-تکام له ( مەلا )یانی به راستی و بەریز ئەوەیه که باوەر بفەرموون من له هەموو کەسێ زیاتر بەچاوی حورمەتەوە روانیومه و ئەروا نمه ئەوان. بەڵام ئەوانه که لیرەدا باسیان ئەکەم. له راستیـیا مەلا نەبوون..**

"رفیق حیلمی".

(2)

## له بەشی سێیەمی پاداشتەکەشدا

## وا باسی جەمال عیرفان کراوه

لەبەر ئەمه که (ئوزدەمیر)ی وریاو زرنگ بەهۆی شاترەکانیەوه و بەهۆی (تایەر) و (ئەحمەد تەقی) لەلای شیخ مەحمود هیوای گەیشتنەوه به خەسرەوی کوری و به گەنجینه تاڵان کراوەکەیان خسته میشکی سمکۆ و پەیمانی ئەوەیان دایه که له هەریمی (شەمدینان) و (وان) زەوی و زاریکی گەورەی بۆ تەرخان ئەکەن بۆ ژیانی خۆی و ماڵ و مناڵ و دەس و پیوەندەکانی، و له بریتی ئەمه له ژیرەوه داوای یارمەتی ئەویشیان کرد بۆ تەفرەدانی شیخ مەحمود لەسەر حسابی تورك (سمکۆ) کەم و زۆر باوەری پێ کردن و بۆ هەل هینانی لیقەومایەکەی خۆی ئەمەی به هەلیك ژماردو لەبەر نەبوونی هیوایەکی له مه رونترو باشتر، نەیویست ئەم هەله له کیس خۆی بدات. (فتاح)ی ژن برای شیخ مەحمودیش له پیش کەوتن و قازانجی نەفسی خۆ بەولاوه شوین مەبەسیکی تر نەکەوتبوو و بۆ ئەمەیش له خزمەتی تورکەکان و بەجێهینانی ئەو تەعلیماتەی که له ئەنقەره وەری گرتبوو هیچی تری به بیرا نەئەهات و بەلای ئەوەوه مەسەلەی شیخ مەحمودو کوردستان هەلیك بوو بۆ بەجێهاتنی مەبەسی خۆی و لەسەری پێویسته زۆر به وریایی و ژیریی کەلکی تەواوی لیوەرگری ئنجا که بەم جۆره شیخ مەحمود کەوته ناو داوی تاقمی ئوزدەمیرو تایەری ئەمین ئەفەندی و فەتاحی ژن برایی و لەولاوه دەوره درا هەرچی بیرو تەگبیریکی تر هەیه له سەریا نەماو بوو به ئالەتیکی بێحس و شعور به دەسیانەوه لەم رۆژانەشدا دەنگیکی سامناك (شایعه مخیفه) لەناو شاردا بڵاوبۆوه، ئەیان وت: "مەلیك عالمه دینیەکانی کۆکردۆتەوەو فەتوای پێدەرکردون بۆ کوشتنی ئەوانەی که لافی منەوەری لیئەدەن و له کفرو رەف خۆیان ناپاریزن". لەو بەینەشدا تازه (جەمال عیرفان) کوژرابوو که یەکیك بو له لاوه نیشتیمان پەروەرەکان و به کافر دانرابوو. ئەم دەنگه کاریکی گەورەی کرده سەر خویندەواره نیشتمان پەروەرەکان و گەلیکیان ئەمەیان ئەبردەوه سەرخۆیان، هەرچەنده هەندیك کوشتنی جەمالیان ئەخسته ئەستۆی خەلقی مەرگه که بەینیك مدیری ناحیەکەیان بوو، گەلیکیش ئەترسان که شیخ مەحمود ئاگای له کوشتنی هەبێ له پیش مردنی جەمالدا ئەوانەی نزیك بون له شیخ مەحمودەوه و چوونه لای شیخ مەحمود، داوای پزیشکی بۆ کرد له کەرکوکەوه بۆ تیمارکردنی، بەڵام زۆر کەس ئەم کارەی شیخ مەحمودیان به فیڵ دایه قەلەم وتیان که بۆ شوینەونی ئەمەی کردووه (جەمال)

ئێوارەیەك لە بانگی مەغریبدا دەس ڕێژی لێکراو هەر ئەو شەوە ئەمری خوای بەجێهێنا بەیانی بە ئەمری مەلیك و بە مەراسیمی عەسکەری نێژرا. دوای ئەم حادیسەیە کە دیسانەوە لە تورکەکان ئەزانرا، وا هاتە بەرچاوی کوردە نیشتمان پەروەرەکان کە ئەم پیلانە بۆ پاك کردنەوەی ئەو جۆرە کەسانەیە ترسی بەرهەڵستی تەقەلای تورکەکانیان لێئەکرێت و بەهاندانی لایەن گیرەکانی ئوزدەمیر ڕێك خراوە. بەڵێ ئیتر دوای ئەم حادیسەیە ترسێکی گەورە کەوتە دڵی لاوەکان و کوردپەروەرەکان و کەسیان بە تەمای گیانی خۆیان نەمان، مستەفا پاشاش لەم دەورەدا لەبەر چاوکەوتبوو خۆم ئاگام لێیە چەند جارێك ئەهاتە دائیرەی شێخ مەحمود ڕێگەی نەئەدرا بێتە ژوورەوە سەرەڕای ئەمەش خرایە ژێر چاودێری ڕەسمی‌یەوەو لە ماڵی خۆیدا چەند پۆلیسێکی بە سەرەوە دانراو ڕێگەی هاتوو چۆی لێ قەدەغە کرا.. ئیتر هیوای تێکۆشین بۆ ڕاست کردنەوەی چەوت و چەڵەمەی ئیدارەو ڕێك خستنی کاروبار لەوێ بوەستێت، بەڵکو ئەوانەی کە بە تەمای دامەزراندنی حکومەتی کورد بوون کەوتبونە مشوری گیانی خۆیان و کونە مشکیان لێ بوو بوو بە عەمار. چونکە ئەوەیان بە بیردا نەهاتبوو کە پێش گەیشتنی وەزع بەم حاڵە کۆمەڵێکی بەهێزی سیاسی دابمەزرێنن و تەقەلای یەك گرتن و ڕێك خستنی ئەوانە بدەن کە ئامانجێکی میللی‌یان هەیەو لەوانەن لە ڕێی حوکومەتێکی کوردیدا لە فیداکاری لانەدەن. خولاسە سەرگەردانی نیشتمان پەروەرەکان لە بێ تەنزیمیدا وە لە نەبونی برۆگرامێکی سیاسی و میللی‌دا بوو.

**دەربارەی کوژرانی جەمال عیرفان:**

لە داناو زاناکانی کورد شەوی چوار شەممە 13/12 کانون یەکەم 1922. بە دەستڕێژێکی چەند کەسانێکی بەدکاری نەناسراو (جەمال عیرفان) کوژرا. بە ناوی هەموو کوردەوە داخی خۆمان دەرئەبڕین لە دڵی هەموو کوردێکا بە ناسۆری ئەمێنێتەوە.

**ڕۆژی کوردستان ژمارە (5).**

لە بابەت ئەو –همت–ەکەی و بزوتنەوە دڵسۆزانەکەی (جەمال عیرفان) و کردەوە پەسەند و دلێرانەکانیەوە لەمەوپێش بینرا و خوێنرایەوە: جا؛ کۆسپی گەورە دێتە پێش پیاوی بەکارو بە نرخ، نەگ گەلور. هەرگیز ناوی جەمال نامرێت و بەشانازیوە مێژوی کورد یادی ئەکات:





# جەمال عیرفان

پاش شۆڕشــەکەی 21 مـایس نەگەڕایــەوە بـۆ سـوپاو وظیفـە: خـۆی ضـابطیکی هونەرمـەند، زیـرەك. بـە توانـا ئـازا، دانـا. و لـە جـەنگی یەکـەمدا رەئیسـی ئەرکانی حەربیەی عەلی ئیحسان پاشـا بـوو لـە عـێراقدا. رۆڵەیـەکی کوردی بە تەو -همت- و ژێر بوو:

جـا؛ بـۆ بـەڕێوە بـردن و دامـەزراندنی، پرۆغـرام یــەك خســتنی ئــەم کۆمەڵانەی، خستە سەر شان و بیری خۆی. و هـەرگیز ماوە نـەدا بزانرێـت و بناسرێ.

هەرچەندە میجرسون لەسەر شۆڕش و جەنگەکەی بەرامبـەر بە مەحمود خانی درزلی لە جەمال زویر بوو بوو. بەڵام هـەر چەکـەرە و ترسـی لێی هـەبوو. نەی ئەویست بیورووژێنێت.

جـەمال زۆر بـە ژیرانـە ئەبزوتـەوە: نەیئەویسـت بێجگـە لـە رووخـاندنی دەزگاکەی میجرسون ئەو کۆمەڵانە بە هیشتێکی ترەوە خۆیان خـەریك بکـەن. بۆ هەر -کۆمەڵە لە تەمە نی 15-25ساڵیدا بۆ کاری گرنگ و نهێنی چوار پێنج کەسی هەڵبژارد بەرنامەیان پێ ئەسپێررا؛ بە راستی بزوتنەوەی کۆمەڵەکان، جێگایان بە سۆن لێژ کرد، و ئەم کۆمەڵانـە هـەر یەکە بە لایەکدا، پەیوەستیان بە سەرەك عەشیرەتەکانەوە پەیدا کرد. و کردیانن بە سوێند خۆر، وردە وردە بە هێمنی و لەژێر پرۆغرامدا ئاشووب، یاخیەتی دەستی پێکرد.

گەیشتە ئەوەی کە سون: هـەر خـەریکی تۆراو و یاخی ئاشت کردنـەوە بێت. رێکەوت باشبوو روپیە بەخشینەوە زۆر بوو.

## ناردنی نومایندە بۆ لای سمکۆ:

لـەم کاتـەدا. لـە ئێران شۆڕشـی (سمکـۆ) زۆ لـە بـرەودا بـوو. جــەمال‌و کۆمەڵەکان بڕیاریان دا کە لەگەڵ شۆڕش گێڕانی ئێراندا پـەیمانێك ببەسترێت. کـە سـەرەك و فـەرماندە (ئیسـماعیل ئاغـا). سمکۆیـەو سـەرەك عەشـیرەتی شوکاکە. کە رۆژ بە رۆژ شۆڕشەکەیان لە تەنینەوەدا بوو: حکومەتی ئێران. بە ناچاری لەسەر ئارەزوو، و زۆرداری‌یان کۆمەکی: نەستۆریەکان: کە دوژمنی: سمکۆ: بوون. بەڵام: لەشکری سمکۆ گەیشتە: سەقزو بانە: لەم کاتەدا سون و ئیگلیزەکان لە بزوتنەوەی ناو شاری سلێمانی ئەترسان، چونکە. کۆمەڵە کان زۆر بەهێز بوون.

سەرچاوە:

چیم دی، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم

شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی مەزن

نووسینی: ئەحمەد خواجە

1968

لاپەرە 62، 63

# جەمال عیرفان

جەمال[1] ئینگلیز خوا بوو، ئەوەندە زیرەك بوو، بە هیچ قایل نەدەبوو. دەیگوت: "ئەو شتەی کە من بیپەرستم، دەبێ بەچاوی خۆم بیبینم، بزانم چ‌یە". گەلێك سەربەرز بوو، لە هیچ نەدەترسا، قسەی زۆر دەکرد. حاجی مستەفا پاشایش[2] وابوو، بەڵام جوداتر بوو، وەنێو نەدەکەوت. جەمال وەنێو دەکەوت.

جەمال عیرفان کابرایەکی دیندار نەبوو، کفر کەر بوو، زۆر کفری دەکرد. هەتا دەڵێن: رۆژێك پیرەژنێکی پشت کۆم و پەککەوتەی دیوە، سەری لێرەو قونی ها لەوێ بووە، گوتوویە: "پووریێ گوایە دەتەوێ لەگەڵ تۆدا بێمە بەهەشت، خوا ئاگادارە نایێم، بۆچی ناچمە جەهەنەم لەگەڵ پیاوی وەك نەمروود و شەدداددا کە لە وێن، ئەوێ خۆشە، نەك لەگەڵ تۆدا بێمە بەهەشت و پیسی بکەی". جارێکیشیان لای شێخ مەحموود بووم، شێخ گوتی: برووسکەی ئینگلیزم بۆ هاتووە، تێی ناگەم. کەس نییە بۆمی بکاتە کوردی. جەمال گوتی: من تێی دەگەم، بێنە بیکەمە کوردی، شێخ گوتی: "نایدەم بە تۆ، ئاوی ئینگلیزت خواردۆتەوە". یەعنی لەگەڵ ئەواندای و خزمەتیان دەکەی، بڕوات پێ ناکەم.

کاتێك جەمال عیرفان بووە بە بەڕێوەبەری مەرگە لەلایەن ئینگلیزەوە، نێوانی لەگەڵ پشدەریاندا خۆش بوو و خۆشیان دەویست. پشدەری نەیانکوشت. ئەوەیان کردوە بە بەهانە کە





گوایە ژنێك لەو مەسەلەیەدا هەبوە. دوژمنایەتیی لەگەڵ پشدەریاندا هەر ئەوە بوو کە عەشایەری خۆش نەدەویست. هێندێك میراودەلیی ئێمە لای شارباژێڕ هەن، زۆر تەنگەتاو و ناڕەحتی کردبوون. دەگێڕنەوە: جەمال کوفری کردووەو، شێخ بڕیاری کوشتنی داوە. لە راستیدا بەبێ قسەی شێخ هیچ نەدەکرا. دەڵێن: شێخە حەمە بچکۆل "حەماغا"ی سەر پاسەوانی خۆی ناردووە بیکوژێ. پار (1983) ئەم حەمە بچکۆلە مرد. پاشتر شێخ لەسەر کوشتنی جەمال، حەمە بچکۆلی دەرکرد[3]. خۆی حەمە بچکۆل کردی و، گوتیان دەستی شێخی تێدا بووە. من گوێم لە شێخ بوو، دەیگوت: "ئاگام لە کوشتنی جەمال عیرفان نەبووە". حەمە بچکۆل کابرایەکی درۆ خراپەکار بوو. دەنا جەمال حەقی کوشتنی نەبوو. پیاوی زاناو خوێندەوار ناکوژرێت.

---

**پەراوێزەکان:**

1–جەمال کوڕی عەبدوڵلا عیرفان ئەفەندی بووە، قوتابخانەی جەنگی ئەستەمبوولی تەواو کردووە. لە یەکەم حکوومەتی شێخدا، ئەفسەری سوارەی هێزی لیڤیی سلێمانی بووە. لە یەکەم خولی حوکمی راستەوخۆی ئینگیزدا کراوە بە بەڕێوەبەری ناحیەی مەرگەو، 1921/9/16یش بە ئەندامێکی ئەنجومەنی لیوای سلێمانی هەڵبژێردراوە (پێشکەوتن یەکەمین رۆژنامەی سلێمانی، ل 353- 354).

2–مەبەستی مستەفا پاشا یامولکی‌یە کە کوڕی عەزیز یامولکی مەلازادەیەکی بیارەیە رۆژی 1865/1/25 لە گەڕەکی گۆیژەی سلێمانی لە دایك بووە. دوای خوێندنی حوجرە، خراوەتە قوتابخانەو 1885/7/1 قوتابخانەی جەنگی ئەستەمبوولی بە پلەی مولازمی دووەم بڕیوە تا لە 1904 گەیشتووەتە پلەی میرئالای. رۆژی 1887/8/18 سەفییەی خانمی حسێن پاشای خەندانی خوشکی سەعید پاشای وەزیری دەرەوەی دەوڵەتی عوسمانیی هێناوە. 1913 لەسەر دژایەتیی ئیتیحادیەکان خانەنشین کراوە 1920/3/4 بوو بە سەرۆکی دیوانی عورفیی یەکەم. دواداویەکانی ئەو ساڵە گیراو درایە دادگا. 1921/2/6 بەرەڵا کراو پاشان دەستی کێشایەوە، شەوی 1921/10/4 گەیشتەوە سلێمانی 1922/7/21 بوو بە سەرۆکی "جەمعیەی کوردستان" و ئیمتیازی رۆژنامەی "بانگی کوردستان"ی وەرگرت. لە دووەم حکوومەتی شێخدا، بوو بە رەئیسی مەعاریف. 1923/6/17 بە یەکجاری سلێمانی بەجێهشێت و چووە بەغدا. تا لە 1936/1/22دا کۆچی دوایی کرد (بیرەوەریەکانی عەبدولعەزیز یامولکی، لە توریکیی عوسمانییەوە وەرگێڕانی شێرزاد کەریم ئامادەو پەراوێز بۆ کردنی سدیق ساڵح، "هەزارمێرد" (گۆڤار)، سلێمانی، ژ 9، ئەیلولی 1999، بانگی کوردستان، ل 37–38).

3–جەمال عیرفان، بە پێی (رۆژی کوردستان 1922–1923، ل 33) شەوی 1922/12/13/12 لە سلێمانی خافڵکوژ کرا. دەروێش ئەحمەد شینکیی ماوەتی بە فەرمانی حەمە بچکۆل کوشتوویە. ساخ نەبوەتەوە کە ئاخۆ حەمە بچکۆل بە هاندانی دیندارەکانی شار یا ئاغایانی پشدەر، یان لەبەر هۆی دیکە ئەوەی کردووە (بیرەوەریەکانی عەلیی حەسەن ئاغای ئاوکورتێ، ل22).


سەرچاوە:

عبدالرقیب یوسف و سدیق ساڵح

بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری

سلێمانی، 2001، ل 132-133.

# فەلسەفەی جەمال عیرفان

رۆژێك چاوم بە كتێبەكانما ئەخشان، لە ناوەڕاستی یەكێكیانا چەند پەڕەیەكی نوسراوم دۆزیەوە، كە سەرنجم دایە بۆم ساغ بوەوە كە هەندێ وتاری فەلسەفی جوان و نایاب و نەمری جەمال بەگی عیرفانە كە ئەهێنێ هەمو لاو و گەنجە پێگەیشتوەكانی كورد بیكەن بە وێردی شەو و رۆژیان. لەبەر ئەمە پێشكەشی گەلاوێژم كرد بۆ نوسینەوەی.

سلێمانی نوری مەجید سەلیم. هۆشیار

1–خەیر بە سواڵكەری كوێر بكە چونكە چاوی لێت نیە، سپڵەییت لەگەڵ ناكا، ئەگەر چاوی لێت بێ بە پەنجە چاوت دەرئەهێنێ.

2–ئەقڵی دوێنێ كەڕوی هەڵێناوە، و هی سبەینێ فەتیرە، بۆ ئینسانی ئەمڕۆ فكری ئەمڕۆ پێویستە.

3–سەگ ئەگەر لغاوی بكەی خۆی بە ئەسپ ئەزانی ئەحیلێنێ.

4–پیاوی عاقل لە مەقامی بەرزا گەورە دیارە بەڵام لە پەستیدا گەورەتر دیارە.

5–كتێب و ژن بە بەرگیانا دیاری نادەن هەتا مندەرەجاتیان تێنەگەی.

6–هەموو شتێ ئەبێ لە جێگای خۆی بێ؛ لە مزگەوت بە سەفیە و لە مەیخانە بە فەقێ باوەڕ مەكە.

7–دەرگای بێ ئەخلاقی گرێژەنە شلە، هەر نەختێ بیكەیتەوە ئەكەوێتە سەر پشت.

8–منداڵ بە بچكۆلەیی سەر ئێشەیە، بە گەورەی دڵ ئێشەیە.

9–هەتا عەردی دوو هەڵ نەكەنی نەمامی راستی مەنێژە چونكە بەر نادا و ناشڕوێ.

10–لە چكی هەر پیاوی چاك تێئەگا، لە خرایی هەموو كەس.

11–چاو بۆ هەندێ سەر پەنجەرەیە، بۆ هەندێكیش ئاوێنەیەو بۆ هەندێك تریش دووربینە.

12–الضرب المثلە البت "ئەو ثابتە نابتە" بەڵام بە شەرتی زەویەكەی پڕ لە پەین بێ.

13–ئەگەر بەرز و قایم قسە بكەی زەرەری نیە بە شەرتی فكری قسەكە بە قەدەر بەرزیەكە قووڵ بێ.

14–مامۆستا! دوێنێ بەسە، دەرس ئەمڕۆیە، جەبرو مەعادەلەش، سبەینێیە.

15–هەموو كەس ئەیەوێ لە دنیادا هەڵگیرسێ بەڵام ئەبێ لە تهلكەی گڕ گرتن بترسێ.

16–بە هیچ وەعدیك باوەڕ نەكردن چاكترە لەوە كە بە هەموو وەعدێك باوەڕ بكەی.

17–لە هەموو بارانێك بە كەڵكتر بارانی ئەرەقی ناو چەوانە.

18–عظمتی درۆ وەك لاستیك وەهایە، شلی بكەی زوو دێتەوە یەك.

19–عەقل هەیە وەك ئاو بە بێدەنگ نفوذ ئەكاتە ئیشەوە، عەقڵیش هەیە وەك بەرداش بە گڕە گڕ ئیش ئەهاڕێتەوە، ئەیكا بە بڕوێش.

20–فرمێسك ئاوی چاوە ئارەقیش فرمێسكی ناو چەوانە.

21–گۆڕینی حس چەند سوك بێ گۆڕینی فكر ئەوەندە گرانە.

22–پیاو پێ بكەنێ نەختێك لە ژن، ژنیش پێبكەنێ نەختێك لە پیاو ئەچی.

23–ئەگەر خۆت زۆر خۆش بوێ، خۆت كەم خۆشەویست ئەكەی.

24–پیاوی عاقل وەك نێرگەلە قسە ئەكا لە سەریەوە ئەچێتە دەمیەوە ئنجا لە دەمیەوە دێتە دەرێ.

25–بەعضی درۆم خۆش ئەوێ چونكە ئیعتباری راستی زیاد ئەكا.

26–شعر موطلەقەن قافیەی پێویست بوایە ئەبوایە هەر بە قەدەر قافیە ئەشعار ببێژرایە.

27–حەیات تابوری وقوعاتە قوماندانەكەی ناوی تەصادفە.

تێبینی:

ئەم نووسینە لە گۆڤار گەلاوێژی

ژمارە (7 و 8) ساڵی 1942 بڵاوكراوەتەوە.



# توتن

جمال عیرفان له ژمارەکانی (64 و 65 و 68 و 70 و 81 و 86 و 88)ی رۆژنامەی (پیشکەوتن)دا له سالی 1921دا زنجیره وتاریکی دەربارەی بایەخی توتن له ئابوری کوردستاندا نووسی و تییدا سەرەرای گرنگی ئەم بەرووبومە له رووی کشتوکالی و پیشەسازی‌یەوە. کیشەی توتن له کوردستاندا له رووی ئابووری و ململانیی چینایەتییەوە جیگەی بایەخی رۆشنبیران و چەپەکان بووە، دلدارو قانیع وەکو دوو شاعیری میللی له شیعرەکانیاندا باسی ئەو کیشەو ژیانی ئەو چینە ماندووەی کوردەوارییان کردووە.

ئەمەی خوارەوە چەند بەشیکه لەو نووسینە:

(1)

زەویەك هەموو وەختێ توتنی لی بچینرێ باش نابێ، سالٚ به سالٚ توتنەکه له سالٚ ئەوەلٚ خراپتر دەبێ. لیره دەبێ ئەگەر چوار پینج سالٚ زەویەك یەك لەسەر یەك توتنی لی بچینرێ چوار پینج سالیش دەبێ ئیسراحەت بکات فەقەت له جیی توتن شینایی تری لی بچینرێ زەرەر ناهینێ.

چونکه شینایی تر به نەوعه مادەیەکی تر لەناو خۆڵا دەژی و مەعیشەت دەکا. چونکه هەر گیایەك نەوعه مەعیشەتیکی هەیه.

پەین- له خصوص پەینەوه ئەفکار جوییه. بەعزێ زراع چاکی و خراپی و بەعزیکیشیان زۆری و کەمی توتن لیك ئەدەنەوە. ئەوی زۆری توتنەکه لیك ئەداتەوە و بەعزێ ئەگەر جیگای موساعد بێ نجاستیش ئیستعمال دەکەن نجاست و پشقل توتن قورس و گران دەکات. پەینی ولاٚخی یەك سم تام و بۆنی توتن خراپ دەکات. بیجگه له زەویەکەدا (مله) و نەوعه حەیوانیکی تر پەیا دەکا. فەقەت پەینی رەشه ولاٚخ تام و بۆنی پێ حاصلٚ دەکا.

بەعزێ زراع دەلین تام و بۆن هەر به بول و پشقلی مەرو بزن حاصلٚ دەبێ هەمو سالی پانزه بیست رۆژ رات له زەویەك دا بنویرنێ ریقنەی مریشك له وەختی ئاو و دانا لەگەلٚ ئاو تیکەلاٚو و ئیستعمال بکرێ زۆر نەفعی هەیه.

زەوی حازرکردن وەکو له سەرەوه عەرزمان کردبو هەموو سالی دوو سەحفته زەویەکه رانی تێ بکرێ. و له نهایەتی پایزدا دەفعەیەك بکیلرێ له بەهاریشدا دەفعەیەك له مانگی مارچ دا و دەفعەیەکیش له ئەوەلی مانگی مایسدا دیسان بکیلرێ. وه زەریف شی بکریتەوه. ئەگینا زەویەکه هەموو نوقتەیەکی وەکو یەك به قوەت نابێ.

تۆو چاندن: بۆ تۆو چاندن ئەگەر مومکین بێ جیگایەك هەل دەبژیررێ که رووی له قیبله بێ و له صبحەینێ وه هەتا ئیوارێ رۆژی لی بدا. دوو سه جار قول هەل بکەنرێو زەویەکه زەریف شی بکریتەوه. ئەوەنده خۆلی هەیه به تەخمین ئەوەندەش پەینی رەشه ولاٚخی تێ بکرێ و جیگای شەتلەکان له ئەرزەوه بستی بەرز بێ.

تۆوەکه چەند بێ دو سه ئەوەنده خوی خۆلی لەگەلٚ تیکەل بکرێ و بچینرێ ئه و جیگایانه که تۆوی زۆر لی رژاوه به لقی داریك بلاوبکریتەوه و سەری شەتلەکان به درکەزی داپۆشرێ. چەند رۆژ له پیش ئەوەدا که تۆوەکه بروێ و سەردەرهینی به پەینی کۆنی وردی کاجوتی بەسەرا داچینرێ و بلاٚوبکریتەوه.

له پاش پانزه بیست رۆژیك تۆوەکه سەردەردەهینێ ئەگەر رۆژ زۆر گەرم بێ رۆژی ئیواران شەتلٚ ئاو دەدرێ و صبحەینان بژار دەکرێ. هەر گیایەکی تیا بێ هەل دەکەنرێ و شەتلی تەنك دەکرێ به گەرما شەتلٚ ئاو نادرێ.

(2)

*له لایەنی توتنەوه هەتا ئیستا زۆر بیژراو باس کرا کەچی هەتا بێ هەر دەداته دواوه. چ توجار چ زوراع هەر هاواریان هەر مەمنون نین.*

ئەمەیش له هەموو کەسەوه دیاره که قەباحەت له خۆیانەوەیه.

لادییه که ئەم رزقه دەچینن هەر هەولی ئەمەیانه پارەی زۆری لەسەر وەرگرن.

هەتا ئیستا تینەگەیشتون که ئەم پاره وەرگرتنەیه مالی ئەوانی ویران کردوه توجار له وەختی خۆیدا که پلپیان لی دەگریت هی ئەم پارەیەیه که له



پێشەوە وەری دەگرن.

بەڵێ دیارە لادێییە کە پێویستە، بۆیە پارە وەردەگرێت منیش دەزانم پێویستە بەڵام هی وایان هەیە بێ جێ و بێ ڕێ خۆی پێویست دەکات خۆی توشی قەرزی زۆر دەکات.

پیاوێك جوتێکی هەیە دەچێت پارە لە توجار دەسێنێت جوتێکی تریش دەگرێت بەڵام ئەو پارەیە کە لە توجاری دەسێنێت یەکاویەکی زەرەر نەبێ سێ بەشی زەرەرە. لە وەختی پێگەیشتنی توتنەکەیشدا هێندە پلێپی لێ دەگیرێت توشی قیڕەو ئەمسەرو ئەوسەر دەبێت حسێبی لەگەڵ بکرێت لەسەر ئەو جوتە کە بۆ قازانجی کرێو بە بیری خۆی وای دەزانی 30،20 باتمان توتنی لێ مشت دەکرێت دو تۆپ جاو و پاشە لقەیەك زیاتر قەرزدار دەمێنێت.

ئەو توتنە کە دای دەچێنێت و بەخێوی دەکات وای بەخێو دەکات کە دو باتمان زۆرتر بێ. چاوی لەوە نیە کە رزقێکی وا بەرهەم بێنێ و وەختی خۆی بە ئارەزووی خۆی لەسەر پشت بیفرۆشێ ئەگەر توجاریش نەیکڕێ توتنچی مەمنون بێ بیکڕێت.

بەڵێ منیش دەزانم کە توتنچی ئەو هەموو توتنەی پێ ئەکڕێت بەڵام ئەگەر رزقەکە باش بێو خزمەتی چاکی بکرێت ئاو وەختە توجارەکەیش بە مەمنونی چوار قران زیاد دەدات و لێی دەکرێت.

چونکە ئەوانەی کە هەر چاویان لە زۆری و بۆرییە توتنەکەیان شتێکی وایە هەر بۆ تونی حەمام باشە جا رزقی کە رەنگی تامی کێشنایکی نەبێ توجاریش ئەگەر بیکڕێت بیری لای خۆی نیە.

بەڵێ زیاتر توجاریش ئەم ئیشەیان بێکەڵك کردوە. کام تجار؟ ئەو توجارانە کە ئەم ئیشی توتنە ئیشی ئەو نیە بە زۆرەملێ سواری بوە ئەگینا ئەوانەی لە باوو باپیرەوە ئیشیانە ئەگەر ئەوانی تر لێیان بکرن دەزانن چۆنی دەکەن و چون دەکڕن و دەیفرۆشن بۆ خۆشیان و بۆ زوراعەکەش کەڵك دەگرێت یەکی دەچێتە دێیەك بێ ئەمەی بزانێ رزقەکەی باشە حەقەکەی گەورەیە یا بچوك ترە یا وشکە دەڵێت توتنەکەت بدە بە من دەیکڕن لادێیەکەیش دەڵێت باشە. لەمەدا هەردولا بیرێکیان هەیە.

لادێیەکە دەڵێت من توتنەکەم نەرمەدیزە، داری زۆرە ترە با دووری بکاتەوە خۆ من دەزانم بیست باتمانە بە پێی باتمانی بیست روپیە پارە 30 باتمانی لێ وەردەگرم ئەوی تریش کە مایەوە بۆ ساڵێکی تر.

توجارەکەیش وای لێکداوەتەوە کە قەپانەکە گەورەیە لەپاش دار بژاردنیش کەم ناکات. ئەمە صەد باتمانێك توتنی هەیە قەلمە نەختێك پارەت دەدەمێ ئەینێرم بۆ بەغداد وە ئەوەل بارخانە بە قیمەتێکی باش دەفرۆشرێت خۆ دیارە ئەمساڵ قیمەتیش کەم دەبررێت. یاخو بە ئارەزوی خۆی لەگەڵی دەبرم ریشی ئەو لە ژێر دەستی مندایە چون بوم باش بو وا دەکەم.

کەچی لە دواییدا نە بیری کابرای لادێی دەبێ و نە حسێبی توجارە کە حسابی هەر دولایان وردکرایەوە تەماشا دەکەیت هەردولا تێشکاون هەردولا حسێبێکی راست و رەوانیان نەکردوە.

ئە گەر بیت و زوراع خۆ کەم قەرزدار بکات و لە پاش پێگەیاندنی رزقەکەیشدا هەوڵ بداو توجارەکەیش بە پێی رزق لە وەختی وەرگرتندا بە قیمەتێ کە بۆ ئەو ساڵە بەکەڵك بێت وەریگرێت و نرخی بڕی پاش هێنانەوە سلێمانی نەك بەو رەنگە کە دیمان ب هێرش و بە کرێی گران وردە وردەبە کرێیەك کە بۆی دەست بدا بینیرێت بۆ بەغداد پلەیش لە وەکیلەکەی ئەکات کە زو بیفرۆشێت وەك توجارێك و کڕین و فرۆشتنی رزقی تر دەستی بدرێتێ ئەم قڕە قڕو دەردی سەری و بێ حسابیە کە هەتا ئێستا بینراوە وا دەزانم نابینرێت.

(3)

## توتن لە بەغدا نرخی شکاوە
## غەیری ماکینە چارە نەماوە

نرخی پێراری لە بەغدجا وەسەتی صەد، پاری هەشتا. ئەمساڵی چلی بیشلخ بوە. ساڵێکی کە موحەقەق ئەبێ بە بیست.

ئێمە نرخی توتنەکەمان و عەرەبەکانیش کلکی حوشترەکەیان.

بۆ ئە م جیهەتە لازمە چارەیەك بدۆزنەوە. چونکە مەدارکەرانی ئێمە توتنە وەڵێ نیعمەتی بێ فتمان توتنە. غەیری توتن بۆ فرۆشتن چی ترمان هەیە. بۆ کڕین چی ترمان هەیە، هەر ئەو تاڵە ئەکەین بە شەکر، هەر ئەو تاڵە ئەکەین بە کوتاڵ.

مەعلومە مەخرەجی توتنی ئێمە. ساحەی فروختمان بەغداد و عەرەبستانە غەیری ئەوی جێگای ترمان بە دەستەوە نیە.

ئینجا یان دەبێ دوعا بکەین لەوێ پارە زۆربێ کە توتنمان گران لێ بکڕن یا سەبیل کیشی عەرەب بەرەکەتیان تێ بکەوێ کە زۆرمان لێ بکڕن. مەعەلئەسەف ئەم دوو جیهەتە بەدەست ئێمە نیە سابیتەو چارە ناکرێ.

دو جیهەتی تر هەیە کە بەدەست ئێمە بێ کە وەکو حاجی عەزیز شەرعی بە ئارەزوی خۆمان هەڵی بسوڕێنین.



یەکێکیان ئەمەیە کە توتنەکەمان کەم بکەینەوە و چاکی تەربیە بکەین.

دووەمیش ئەمەیە کە ساحەی توجارەتەکەمان تەوەسوع بکەین و تەوسیعی ساحەی توجارات و تەزییدی موشتەری متەوەقفە بە سەعی و هیمەتی خۆمانەوە. چونکە ئەگەر توتنەکەمان چاك بێ هەر بە عیراقی نافرۆشین بە ئینگلیز و بە ئەوروپایی و بە هندی و بەهەموو قەومێك قابیلە بفرۆشرێ.

بۆ حصوڵی ئەم مەقصەدە ئێمە ئەبێ واز لە عەقڵی سەقیمی قەدیم بهێنین نەختێ متمایلی فەن و صنعەت بین. زەمانی ئەوە نەماوە هەر لە تەبیعەت ئیستیفادە بکرێ. وەکو هەمو قەومی ئێمەیش نەختێ ئیستمداد لە صەنایع و مەعاریف حازر بکەین بۆ ئێمە موتەخەصیص زەراعەتی توتن و ماکینە صاچاخ (رشتە) لازمەو شەرتی ئەعزەمە ماکینە رشتە بۆ حەیاتی ئیقتیصادی ئێمە روحێکی تازەو بە قیمەت دەبەخشێ.

موتەخەصیص توتن دو سەد ساڵ فێری زەراعەتی توتنمان بکات. قەڵەمەکانیشمان وەستاو ماکینە رشت جەلب بکەن ئەو پانزە بیست هەزار بار توتنەی هەمانە پێنج هەزاری بکری بە رشتە دە پانزە هەزار باریشی هەر وەکو ئێستا بفرۆشرێ زەرەری نیە.

پانزە هەزار بارەکەی ئێستامان بە حسابی شەش باتمانی و باتمانی سلێمانیش زۆر زۆر بە نود بیشلغ بێ ئەکاتە 1012500 روپیە بێجگە لە رەسم و کرێ و خەرج و مەصرەف و سائرە.

ئەو وەختە کە دە هەزار بار توتنی عادی رشتە نەکراومان بمێنێتەوە عەرەبەکان وەکو نان و حەلوا ئەیقۆزنەوە بە قیمەتێکی گران ئەیکڕن، هەر قیمەتی ئەم دە هەزار بارە ملیۆنە روپیە کە بە زیادەوە ئەهینیتەوە. و پێنج هەزار باری رشتە کراویشمان قازانج ئەمێنێتەوە ئەم پێنج هەزار بارە رشتە کراوە دەکاتە 30000 باتمان و 600000 کیلۆ لەگەڵ پاکەتی جغرەی تورك و جغرەی سیزو رو تری فاستل یش مقایسە بکەین توتنی پاکەتی تورك صەد غرامی بە دە قروشە 50 جغرەی تری قاستلیش ئەدەن بە دو ئەم 50 جگەرەیە گەر مساعەدەیشی بکەم هەر صەد غرام دەردەچێ ئەگەر دە قتوی کیلۆیەك بێ کیلۆی ئەکەوێتە 20 روپیە 600000 کیلۆ روپیە فەقەت تو چونکە حاجیت وەکو پاکەتی تورك و سیزور و تری قاستل کرانی مەفروشە بە روبعی ئەو قیمەتەی بدە.

دیسان پێنج هەزار بار توتنەکەمان 3 ملیۆن روپیە ئەگرێتەوە.

ئەو وەختە تۆ بەم توجارەتە بکر هەموو شتێك بکڕە

هۆقەی توتن توپی کول هۆقەیی.

شەکرو چایی نامنتاهی

چی بکەم بۆ صەد هەزار روپیە

(4)

تیجارەتی توتن بۆ ئێمە یەعنی بۆ ئەم موحیتی کوردەواریە لە واقا وەڵێ نیعمەتێکی بێ منەتە. واستە بەخێوکردنی توتنە بە راستی غەیر توتن بۆ فرۆشتن چی ترمان هەیە، کوا تیجارەتمان کوا فابریقەکان. کوا ماکینەمان کوا واستەیکی ئیدارەو خۆش رابواردنمان. ئەوا توتنمان بۆ فرۆشتن نەبو ئەم هەموو ئیحتیاجاتەمان بە چی دەفع ئەبێت. بەچی چیت ئەکڕی بەچی شەکر ئەکڕی ئەم توتنە وەنەبێ هەر قازانجی بۆ ئەو قەڵەمچیانە بێ کە ئەیفرۆشن بەڵکو هەموو کەس لە خەلقی ئەم موحیتە هەر کەسە بە میقدارێ نەفع و قازانجی توتنی پێ ئەگات.

لە زەراعەتەکەدا ئاودێر بەش ئەبا زراع بەش با صاحێب موڵکیش بەش ئەبا حەتا جوتیارو ئاسنگەریش بۆ جەوت و گاسن بەقەدەر خۆیان بەش ئەبەن لەپاش ئوە قەلەمچی قازانجی لێ ئەکاو هەر بەو پارەی توتنەی ئەنواع بەرو پیتی بێ ئەکرێ لە پێش چونە بەغداد ناوی قەڵەمچیەکە هاتەوە ئەبێ بە تاجر.

ئیحتیاجاتی ئێمە دەفع ئەکا هەر توتنەکەی ئێمەیە بۆمان ئەگۆڕێتەوە بە لەوازماتی زەروریە ئەگەر توتن نەبوایە ئەم ئەشیای مبرمە بە چی سەرمایەیەك ئەکرێ کوابێ وەکو لە سەرەوە عەرزمان کرد توتن وەلی نیعەمەتێکی بی منەتە ئەمجا زۆر لازمە چارەیێك بۆ موحافەزەی تیجارەتی توتنەکەمان بدۆزینەوە ئەم چارەیش وەکو لە غزتە پێشودا جەمال بەگ فەرموبوی تەنها بە هێنانی ماکینە عیلاج ناکرێ ماکینە کرچی بۆتە فەوتان تەرەقی تیجارەتی توتن واستەیەکی ئەعزەمە بەڵام ئەوی کە بە حەقیقەت و بە تەواوی موحافەزەی فەوتانی بکات و واستەی تەرەقی بێت شرکەتێکی عمومی‌یە. لە هەمو مەملەکەتێك و لەناو هەموو قومێکی موتەرەقیدا هەر شەرکتە ئیش ئەبینی. ئیشی یەك کەسی قوتی کەمە. تەوحید قوات بۆ حەیات عمومیە هەموو ئیشێك ئاسان ئەکات تەماشا بکەن موتالەعە بکەن هەموو سەیر سفاین رێگای ئاسن ری تراموای فابریقە صنایع تیجارەت بە واستە شەرکتێکەوە دێتە وجود.

(5)

کوابی ئێمەش تیجارەت توتنەکەمان بەناوی شارەکەمانەوە تەنزیم بکەین. هەر کەسێ کە ئێستا توتن ئەکڕی یا لەمەودوا موتەمایل تیجارەت توتنە شەرکەتێکی عمومیە عەقد بکەن. بۆ ئەم شەرکتە سەنەدات حصە ئیجاد بکرێ هەر سەنەدێك لە تەرەف قومپانیەوە بە دە لیرە بفرۆشرێ یەعنی ئەوی پەنجا لیرە لەو شەرکەتەدا ئەبێ بە پێنج ئەوی پێنج سەد لیرەی ئەبێ پەنجا حیصەی قازانجی لە شرکەتدا بێ.

شیرکەت. یاخود قومپانیە لە سلێمانی مەسەلەن لە خانە سوتاودا مەرکەزێکی عمومی ئەبێت. لە ئەمنیەت و نەزارەت حکومەتدا مودیر مەسئول و مەئمور باش و قاصە مەزبوت و هەیئەت حسابیەی بێ هەرچی توتنی لە موحیت و مەملەکەتەکەی خۆمان بچێنرێ بە پێی خۆی بە ولاخی خۆی بە دارك بژیراوی پاك و پوختە لە خراردا بیهێنن بۆ خانە سوتاو کە مەرکەزا قومپانیە و تیجارەتی عمومی‌یە ئەبێت. ئەو وەختە لە تەڕەف حکومەتەوە بۆ توتن چ نرخێ بڕرابێ بەو نرخە قۆمپانیە بیکڕێ. بە قەپان بەلەدیە فرێی بداتە ئەنباری قۆمپانیەوە.

خۆ ئەگەر توتن هینان بۆ لادییی زەحمەت بی یاخود لازم بی بۆ ئەوەی کە خراپ نەبێ و رەنگی تیك نەچێ لە تەرەف قۆمپانیەوە داگیرێ و هەروەکو ئیستە لە تەرەف قۆمیسیۆنەوە بۆ داگرتنی پیاوی شارەزای زۆر باش بۆ هەموو ئیستقامەتێ سەوق بکریت کە هەموو توتنی ئەو مەنتیقەیە بە پیی تەعلیمات رەوانە بکاو بۆ هەموو نەوعە توتنێ نەوعە نمرویەك و نرخیك ببریت و لە میعادی خۆیا یەعنی کە لە بەغدا توتن زۆر لازم بێ بە پیی ئیحتیاجی ئەوێ سەوقی بکا بۆ ئەو قۆمپانیایەی کە لە بەغدا دائەنریت "تەبیعی قۆمپانیای بەغدا شوعبەیەکی قۆمپانیای ئیرە دەبێ و بە پیی ئە مرو تەعلیماتی ئیرە حەرەکەت ئەکا" ئەو قۆمپانیەیە بە ئارەزووی خۆی نایفرۆشێ لیرە حکومەت چ نرخیکی بریبێ و لە دارك بژاردن و تەفەزوعاتی سائیرەدا چەند کەم بکاو مەصرەفی عمومی هەر لە لادیوە کە دائەگیرێ هەتا ئەگاتە بەغدا چی تیئەچێ حساب ئەکرێ و بۆ ساحیبی حیصەکان قازانجیکی زۆر باش عەلاوە ئەکرێ ئەو وەختەش بێ تەرك و سەماح و فوکانی ئەفرۆشرێ.

قۆمپانیەی پاوەی ئەو توتنانە کە مانگ بە مانگ ئەیفرۆشێ لە قۆمپانیەیەکی موئتەمەن بە نرخیکی هەرزان ئەو ئەشیاو ئەمتیعەیەی کە بۆ موحیتی ئیمە لازمە وە دەست ئەدا بیکریت و بە ناوی قۆمیسیۆنی ئیرەوە رەوانەی بکا.

# حقايق

1–صەدەقە بە سواڵکەری کوێر بکە، چونکە چاوی لێت نیە سپڵەیت لەگەڵ ناکا. ئەگەر بت بینێ معاذاللە.

2–عەقڵی دوێنێ کەڕوی هێناوە، هینی صبحەینێ فەطیرە، بۆ ئینسانی ئەمڕۆ فکری ئەمڕۆ لازمە.

3–سەگ لغاوی بکەی خۆی بە ئەسپ ئەزانێ و ئەحیلێنێ.

4–شەڕ بەدەست دەکرێ، فەقەط جیدال حەیات بەسر.

5–ئینسان سەربەست بێ بێ تەربییەیە، فەقیر بێ ئەحمەقە.

6–نە زۆر کۆم و نە زۆر قیت نەڕۆی، کەس گاڵتەت پێناکا.

7–پیاوی عاقڵ لە مەقامی بەرزدا گەورە دیارە، فەقەط لە پەستیدا گەورەتر دیارە.

8–کتێب و ژن بە بەرگیاندا دیاری نادەن هەتا موندەرەجاتیان تێ نەگەیت.

9–هەموو شتێك دەبێ لە جێگای خۆی بێت، لە مزگەوت بە سەفیە لە مەیخانە بە فەقێ باوەڕ مەکە.

10–ئینسان قەد نابێت بە دوژمنی تەواوی ئەو کەسەی کە خۆشی ناوێت، چونکە لەگەڵی نادوێت.

11–لە قاوەخانەو لە جەماعەت گۆشەو کەنار بگرە، چونکە هیچ نەبێت لایەکت رەحەتە.

12–عەشق میوانێکی بێ مەعنایە بێ پرس دێت و بێ سەبەب دەڕوات.

13–دەرگای بێ ئەخلاقی گرێژنەی شلە، هەر نەختێ بیکەوە دێتە سەرپشت.

14–بەعزێ کەس ریاو حەیا فەرق ناکەن، وا دەزانن بێ ریایی بێ حەیاییە.

15–منداڵ بە بچکۆلەیی سەرئێشەیە، بە گەورەیی دڵ ئێشەیە.

16–فیراق و جوێ بوونەوە نیو مصراعی شیعری خۆشەویستیە.

17–دڵ سەعاتێکی درۆزنە، جارجارێ رۆژی بە قەد مانگێك درێژ، بەعزە مانگێ بە قەد رۆژێك کورت دەنوێنێت.

18–سەروەت و دەوڵەت، قەرزاری درۆو بێ ئینصافیە، دەوڵەمەندێك سەبەبی فەقیری هەزار کەسە.

19–هەتا عەردی درۆ هەڵنەکەنیت نەمامی راستی مەنێژە، چونکە بەر ناداو نایشڕوێ.

20–لە چاکیی، هەر پیاوی چاك تێدەگات، لە خراپیی هەموو کەسێك.

21–ئەڵێن ئەگەر کەڵەشێر شەو زۆر بخوێنێ، درەنگ رۆژ دەبێتەوە خۆ ئەگەر مریشك زۆر بخوێنی رۆژ قەد نابێتەوە: مەگەر لە مەکتەبی کچان نەبێ.

22–چاو بۆ بەعزێ سەر تەجرەبەیە، بۆ بەعزێ سەر ئاوێنەیە، بۆ بەعزێکیش دوربینە.

23–پارەپەیاکراو وەکو کێچ و ئەسپێ وایە خوێنی خەلقی دەمژی، خصوصەن کێچ خوێنی جنسی خۆی نامژێت.

24–ضرب المثلة الين (من ثبت نبت) یەعنی ئەوی سابتە نابتە، فەقەت بە شەرتێ عەردەکەی پڕ لە پەین بێ.

25–ئەوی بە بەهایەکی زۆر بیگری هەموو وەختێ قیمەتدار نیە، بەها جۆییە قیمەتیش جۆییە، نانێکی بێ بەها لە نەفسی ئەمردا قیمەتدارە، ئەلماسێکی بێ قیمەت بەهادارە.



26–حوقەبازو بەعزێ صنف دو پشتیان لازمە، لە خۆیدا حیلە و مەهارات لە تەماشاکەرانیشدا بەلاهەت و حەماقەت.

27–کۆکەو کۆکە رەشە، حوممای حوممای ئەصفەر، هەر رەنگیکی رەش و زەردیان فەرق هەیە.

28–ئەگەر بەرز و قایم قسە بکەی زەرەری نیە بە شەرتێ فکری قسەکە بە قەدەر بەرزیەکە قوڵ بیت.

29–مامۆستا، دوینییە، دەرس ئەمرۆیە، جەبرو معادەلەیش صبحەینێ.

30–هەموو کەس دەیەوێ لە دنیادا هەلبگیرسیت، فەقەت دەبێ لە تەهلەکەی گرتن بترسێ.

31–لە دنیادا ئینسان جیگای لە نوقتەی ناوەراستی ئەو خەتەدایە کە سەریکی بەدەست دوشمنانی و سەریکیشی بەدەست دۆستانیەوەیە.

32–جلی جوان جارجار بۆ باڵانیشنی جەسارەت دەبەخشێ. فەقەت وەکو کەولەکەی مەلای مەزبورە موفتیە.

33–خۆت هەر زمانت حفظ بکە، حفظی ئەعضاکانی ترت عائدە بە خوا.

34–ئەگەر ظەرافەت و گالتەچیش بی. خوی و بەهاراتەکەیشی تەربیەیە.

35–بە هیچ وەعدەیەك بروا نەکردن چاکترە کە بە هەموو وەعدەیەك بروا بکەی.

36–پیاوی روخۆش سپی و روناکە پیاوی عەبوس رەش و تاریکە.

37–هەموو شتیك مەربوتی قەدەرە، بەعزەن بۆ ئالتون بگەرییت ئاسن، بۆ ئاسن هەول بدەیت ئالتونت توش دێ.

38–لە هەموو بارانیك بە نەفع تر عارەق و بارانی ناوچاوانە.

39–عەزەمەتی درۆ وەکو لاستیك وایە. شل بکرێ زوو دیتەوە یەك.

40–بەسەر ژندا بەعزێ کەس بە تەمەلوك عاقلانە بەعزیکیش بە تەحەکوم جاهلانە فەخر دەکات.

41–عەقڵ هەیە وەکو ئاو بە بێ دەنگ نفوز دەکاتە ئیشەوە عەقلیش هەیە وەکو بەرداش بە کرەکر ئیش دەهاریتەوە دەیکا بە برویش.

42–رژانی حەفەت بەسەر عەشقدا وەکو رژانی خەلوز بە سەر ئاگردا وایە. لە پیشدا دایدەپۆشی، لە پاشدا خەلوزەکەییش دەبێ بە ئاگر و هەمویشی دەبێ بە خۆڵ بۆ سەر ئاسن موقەدەسە گەر ببێ بە گاسن، مەلعونە ئەگەر ببێ بە زنجیر.

43–فرمیسك ئاوی چاوە ، عارەقیش فرمیسکی ناوچاوانە.

44–گۆرین حس چەند سوك بێ، گۆرین فکر ئەمەندە گرانە.

45–ئەشرەف ساعەت کە نازانی کەیە، لە ئیشەکەت رامەوەستە.

46–ئەشرەف ساعەت بۆ ئیشی باش ئەوەڵ ساعەت بۆ ئیشی خراپ ساعەتی نیهایەت.

47–بۆ ئیشی باش پژمین ئەشرەف ساعت تیك نادا.

48–پیاو کە پیبکەنێ نەختێ لە ژن، ژنیش پیبکەنێ کەمێ لە پیاو دەچێ.

49–بە عەقلی من حیات قومارە بەعزێ چاکیش قومار بزانێ هەمو وەختێ دو شەش ناهاوێ دوو خانە ناگرێ.

50–ئەگەر خۆت زۆر خۆش بویت، خۆت کەم خۆشەویست دەکەی.

51–هەرچی رەواجی بێ، زیاد دەکات، راست، درۆ، حنفیش، بنك کیش.

52–پیاوی عاقڵ وەکو نیرگەلە قسە دەکات، لە سەریەوە دەچیتە زکی، ئینجا لە دەمیەوە دیت دەرەوە.

53–دەلین خۆشەویستی بە پارە نابێ، ئەما باوەر ناکەم خۆشەویستی بێ پارە و بێ نەفعیش هەبێ.

54–فەقەت ئەو خۆشەویستیە بە ئالتون دەست کەوێ زوو دەبێ بە تەوق ئاسن.

55–عاشقینی وەکو چونە سەر شاخ وایە چونکە کری و زەحمەتی نەبوایە نەزارەت و هەواکە خۆشبوو.

56–بەعزێ درۆم خۆش دەوێ، چوکە ئیعتباری راستی زیاد دەکات.

57–شەر موتلەقەن قافیەی بویستایە، دەبو لە دنیادا ئەشعار هەر بە قەد قەوافی بیبژیررایە.

58–ئەگەر باوەر بە ئاخیرەت نەکرایە، عیلم هەموو دەبو بە حفط الصحة، وە عالەمیش هەمو بە حەکیم.

59–پیاوی بێ ریا نویژ بکات لە تەحیاتدا ئەژنۆی قەت هیلاك نابێ.

60–حەیات تابوریك وقوعاتە، قوماندانەکە ناوی تەصادوفە، لە دنیادا پیاویکی بولشەویك و سوسیالیستی بە قوەتیش دەناسم وە رفیقمە ئەویش ناوی ئەجەلە.

لە دوو سیمای تەضاددا سیاحەت خەیالیە

( فەلسەفە )

وەکو چۆن حەقیقەتی مەحض مەجهولە، عیبارەتە لە حس و خەیاڵ، خەیالیش فکریش بعظا عیبارەتە لە حەقیقەت و بەلکو هەر عەینی حەقیقەتە.

من دەلیم وەکو چۆن سیاحەتی جسمانی هەیە. بە فکر و حسیش سیاحەت دەبی وە قابلە. سیاحەت حس و فکر ئاه ئەی حسی ناسوتسوزو لاهوتی نوازی شرق. ئەی سەبەبی عەللەت و مانع تەکامول مادی. ئەی جەناح شیعرو ئەساتیر. مولد رومی و خیام و نالی.

علویت مەعنا وقوت. سفلیت مادە و عەرز هەموو شتێ زادەی حەس و خیال و فکرە ئەی حس بدیع تو مولود زادەی جسم نبویتایە و لە میشکیکی منفسخ صدرورت نەکردایە و هەل نەقولایتایە. موجەرەد بی واستە و موستەقیل بویتایە. الامی امراض لوث شئونات بەسەر تۆدا تەئسیری نەبوایە عضوی غیرە عضوی شتیکی بە قەت سەری درزی یەك شەوق و شعوتی نەکردایە بە شین و فغان و تولە هیچ موتەئثیر نەبویتایە و افولت نەکردایە، ئەو وەختە حاکمیەتی موتلەق دەبو. ئەو وەختە راست و رەوان. لە کل نامتناهیت قریب و قرین دەبوی.

سەرچاوە رۆژنامەی پیشکەوتن



## اقتصادی

مامە هۆمەر صەد شوکر تۆ قوت و چاوت هەیە
هەر لە دییەك چەن رەزو چەن عەردی بەراوت هەیە
توتنەکەت قیمەت نەکا صەد ئیشی تر بۆت قابلە
دی بەرت زەرعی پەموکی ئەوە ریس جاوت هەیە
توتنەکەت قیمەت نەکا مازو کزو پیست و خوری
شالی زۆر جوان نەجیبی دەشت خوشناوت هەیە
قۆڵ لە پەستەك هەلبکیشی بچیە کیوی بۆ شکار
بۆ تیجارەت وەك دەلك. وەك ریوی صەد راوت هەیە
حەلقی کەندی روخی زی دین کوی وانیك هەیە
تۆش فەقەت زۆر کوشتی. ماسی بیست سکلاوت هەیە
شازدە کندە فور و پنحصر پر چنار بو بە کلك
هەر بە با ئەرواتە بەغدا چوکە تۆش ئاوت هەیە
مەصرەفت کە زۆرە چایی لی منی بۆ داعیە
باستق و سنجوق و کویرژ و میوژە خولاوت هەیە
هەرچی میوەی ناو بەهەشتە تۆ لە دنیادا هەتە
کالەك و شوتی و تریّ و هەنجیری ریژاوت هەیە
عادەت و چاولیکەری وا چای بەحرەت کردوە
فەزلەیە بیخۆیتەوە دوشاو و خۆشاوت هەیە.
قۆندەرەت هەر با نەبیّ چی لی ئەکەی لۆ قون دزە
یمنی، کەوش و کلاش و چەرم و پیتاوت هەیە
بۆ سەرو پیچە زلەو پشتین و هەشتا زرعیە
بۆ کولنجە مەخمەلە لۆچی ئاتو ناوت هەیە.

سەرچاوە:
پیشکەوتنی ژمارە (94)
چەند پەندیکە لە داهینانی جەمال عیرفان

# چاو پیکەوتنیك لەگەڵ خیزانەکەی جەمال عیرفاندا

کەمال نوری مەعروف

دەمیك بوو حەزم دەکرد شتیك لەسەر جەمال عیرفانی[1] شەهید بنووسم، ئەو جەمال عیرفانەی کە بەرەو رووی ئیستعماری ئینگلیزی داگیرکەر نەراندی و بەخۆیی و چەکدارەکانیەوە گەرایەوە بەر دیوانی شیخی نەمرو پەیمانی دایە هەتا دوا تنۆکی خوینی بجەنگیّ بەرامبەر داگیرکەران و رۆلەیەکی بە ئەمەك بیّ بۆ گەل و خاکەکەی. سەرچاوە میژووییەکان گەرام بە هیوای ئەوەی هەندیّ زانیاریم لەسەر ئەو رۆلە کوردە دەستکەویت، بەڵام هیچی وام دەستگیر نەبوو، هاورییەکی خۆشەویستم وتی: (برام دەمیکە حەزدەکەیت شتیك لەسەر جەمال عیرفان بنووسیت بۆ ناچیت چاویکت بە خیزانەکەی بکەویت هیشتا لە ژیانا ماوە، بەشکم بتوانیت یارمەتیت بدات). زۆر حەزم بەم دیدەنی‌یە[2] کرد، خۆمان بۆ ئامادە کرد، بەو هیوایەی هەندیّ لایەنی ون بوو لە ژیانی ئەو رۆلە کوردە زیندو بکەمەوەو، کەمیك تەمومژ برەوینمەوە بەوەی ئەو پیاو کوژانەی کە چرای تەمەنی جەمالیان کوژانەوە کین و لەچی بەرەیەکن؟ ئایا دوژمنایەتی تاکە کەسی‌ی بوو بەهۆی کوشتنی، یان دام و دەزگاکەی میجرسون[3]؟ گەیشتینە شوینی دیاری کراو، لە ژوریکی خنجیلانەی قورینەدا پیریژنیك لەسەر قەرەویلەیەك دانیشتوە، تەمەنی دریژ زۆر شتی لەبیر بردبۆوە، چرچی دەم و چاوی شریتی عومری رابووردوی نیشان ئەدا، لەوە ئەچوو لە هەرەتی جوانیا لی‌ی قەومابیّ و بە ئاوات نەگەیشتبیّ خەمەکانی ئەستوور بوو، هەر سەوزی مابۆوە، وازی لی نەهینا تا لەگەلیا چوە ناو قەبری تەنگ و تاریکەوە[4]. لی‌ی چوومە پیشەوە دوای ئەوەی خۆم پیناسان، وتم هەندیّ پرسیارت لی‌ئەکەم لەسەر جەمال عیرفان، وەڵامم بدەرەوە، سەریکی بۆ لەقاندم، لەوە ئەچوو نیشانەی رازی بوونی پیوە دیاربیّ.

بەم پرسیارە دەرگای قسەم کردەوەو وتم:

**پ: خۆتم پیّ بناسینە.**

وەڵام: ناوم خەدیجە ئیسماعیلە، باوکم چەرکەسیە[6]، لە ئەنقەرە لە دایك بووم، دوای لە دایك بوونم بە ماوەیەك هاتینە مووسڵ، لەویّ نیشتەجیّ بووین. لە تەمەنی (3) سالیدا باوکم مرد، دایکم گەورەی کردم و نەیهیشت بیّ باوکیم پیوە دیاربیّ، بەڵام دایکم زۆر دانەنیشت و بۆ جاری دووەم شووی کردەوە. ئەو ئافرەتانەی لە منالیدا شیریان دامیّ حەزیان ئەکرد ببمە منالیان بەڵام دایکم رازی نەئەبوو.

**پ: چۆن جەمال عیرفانت ناسی؟**

وەڵام: لە پیش ئەوەدا بنیریتە خوازبینیم جەمال عیرفانم نەئەناسی و منی هەر نەدیبوو، لە خوازبینی کردندا چاوی بە ناوچەوانم هەر نەکەوت، لە سەردەمی ئیمەدا ئافرەت گیانی داپۆشراوە بوو کوونی چاویشی بە دەرەوە نەبوو کە پیاو بیبینیّ چارەنووس کردمی بە هاوسەری و کورو کچیکم لی‌ی بوو.

**پ: چۆن جەمال شەهید کرا؟**

وەڵام: ئیوارە بوو هیشتا بە تەواوی لە نان خواردن دەسمان نەگرتبووە، جەمیلەی کچی بە خاولیەکەوە لای باوکی وەستابوو بۆ ئەوەی دەستی بشواو خاولیەکەی بداتێ، ریکەوت وابوو شوینی دەست شتنەکە لای دەرگای دەرەوە بوو، خەریك بوو دەستی ئەشت کە یەکیك لە دەرەوە بانگی کرد وتی جەمال بەگ لە مالە..؟

هەر خۆی وەڵامی دایەوە وتی: فەرمو لە مالە، هەر ئەوەندەمان زانی دەستریژیکی لیکراو کەوت، چووینە سەر لاشەکەی هاوارمان لیکرد کێ کوشتتی، وتی: دوژمنی خۆم ئەناسم ئەگەر نەمردم و ژیام چاریان ئەکەم، سەیریمان کرد گوللەیەك بەر باتووی کەوتوە، هەموو کاتژمیریك نەژیا مرد.

**پ: ئەحمەد خواجە دەڵێ (کە جەمال عیرفان کوژرا چووم بۆ لای شـیخ، شیخ ئەگریا ئەی وت: جەمال برای شیرینم بوو، دۆستایەتیەکەیان هیندە بەتین بـوو ئەی وت: شەرتە خوینی ون نەکەم).**

وەڵام: بەلی برایەتیەکەیان زۆر بە تیین بوو، بـرای شیرینی بوو. شیخی نەمر زۆری رۆژەکانی لە مالی ئیمە بەسەر ئەبرد، خەریکی قسـەی خۆش و گۆرانی وتن بو لەگەڵ جەمالدا[7].

**پ: ئایا هیچ دەستنووسیکی لە پاش بەجێماوە؟**

وەڵام: بـەلێ گـەلیك دەستنووسـی لـە پـاش بـەجێ مـا، هـەندێ لـەو دەستنووسانە لەم ساڵانەی دواییەدا کەوتە دەست مامۆستایان جەمال بابان و شیخ محەمەدی خاڵ. تا ئیستا سەروو سۆراخیان دیار نییە.

---

**پەراویزەکان:**

1–جەمال عیرفان ئەفسەریکی کوردی هونەرمەندو زیرەك و بەتواناو ئازا بوو، لە جەنگی یەکەمدا (رەئیسی ئەرکانی حەربیەی عەلی ئیحسان پاشا بوو لە عیراقدا). لەناو سووپاو سوپاییەکانی تورکدا جیگاو پلەیەکی تایبەتی و زۆر بلندی هەبوو. دوایی گەرایەوە نیشتمانەکەی خۆیی و بوو بە یارمەتی دەری شیخی نەمر شیخ کردی بە فەرماندەی گشتی هیزی سوارەی سوپای خۆی (ئینگلیزەکان ناویان نا لیڤی).

بۆ زیاتر

بروانە بەرگی یەکەم- بەشی یەکەم –چیم دی- نووسینی ئەحمەد خواجە.

2–ئەم چاوپیکەوتنە لەکاتژمیری چواری دوای نیوەرۆی 6–2–1980دا کرا، قسەکان لەسەر شریتیکیش تۆمار کرا.

3–لە ژمارە (5)ی رۆژی کوردستان و ئەم هەواڵە بەم جۆرە بلاوکراوەتەوە:

لـە دانـاو زاناکـانی کـورد شـەوی چـوار شـەممەی 2–13 کـانونی یەکـەم 1922 بە دەستریژیکی چەند کەسانیکی بەدکاری نەناسراو (جەمال عیرفان) کوژرا.

بەناوی هەموو کوردەوە داخی خۆمان دەرئەبرین لە دلی هەموو کوردیکا بە ناسۆری ئەمینیتەوە.

گومـان لـەوەدا نیـیە کوشـتنی جـەمال عیرفـان ئـەنجامی دوژمنایەتیـەکی تاکەکەسی بوەو هیچی تر..

بۆ زیاتر

بروانە رەفیق حیلمی –یادداشت- بەرگی شەشەم – بەغداد 1958 لاپەرە چل.

وە پاشکۆی رۆژنامەی عیراق – ژمارە 31 تشرینی یەکەمی 1979 لاپەرە 13،14.

–پاشکۆی رۆژنامەی عیراق- ژمارە 33، ت –1979 لاپەرە 8، 9.

4–دوای چاوپیکەوتنەکە بە چەند مانگیك دلی گەورەی ئـەم ئافرەتـە لـە لیدان کەوت.

5–عیرفان نازناویەتی، ناوی جەمال عبدالله یە.

6–چەرکەس گەلیکە لە یەکیەتی شوورەوی.

بروانە: الموسوعة العربية الميسرة– 1082.

7–ئەوەی شایانی باسە تا ئیستا کەم کەس و کۆر هەن شیخی نەمر گۆرانی بۆ وتبێ، بەلام ئەوەندەی جەمال خۆش ئەویست زۆربەی رۆژ (وەك خیزانەکەی بۆی گیرامەوە) چۆتە لای جەمال و لەسەر قەنەفەیەك بەرامبەر جەمال دانیشتوە، گۆرانی (ئەللاوەیسی) بۆ جەماڵی خۆشەویستی خۆیان وتوە، هەمو جاریکیش بە گالتەوە پـێی وتوە: جەمال لەبەر ئەوەی تۆ ماوەیەکی زۆر لە تورکیا بوویت میزاجی کوردەواریت تیك چوە بۆیە ئەللاوەیسی خۆمانەت بۆ ئەلیم.

**تیبینی:**

**ئەم چاوپیکەوتنە لە ژمارە 16ی نیسان 1982ی پاشکۆی عیراق بلاوکراوەتەوە**



# دیداریك كه نه‌كرا!

**شه‌مه 5/26**
**سه‌عات 1800**
**له مالی كاك نه‌وشیراون**

**ئاكۆ كه‌ریم مه‌عروف**

ده‌وروبه‌ری پیش نیوه‌رۆی رۆژی شه‌ممه بوو، گه‌یشتمه به‌رده‌م پرسگه‌ی وه‌زاره‌ت، له خه‌ون و خه‌یالی ئه‌وه‌دا بووم كه ده‌بێ ئه‌و پرسیارانه‌ی له‌سه‌ر پارچه كاغه‌زیك تۆمارم كردووه، ده‌بێ چ وه‌ڵامیكیان هه‌بێ‌و، چ نهینی‌یه‌كی تر له‌ودیو تیرۆر كردنی (جه‌مال عیرفان)ه‌وه ئاشكرا بكات؟

له پرسگه‌كه‌دا چه‌ند هاوڵاتی‌یه‌ك له چاوه‌روانی دیتنی وه‌زیردا بوون و هه‌ندیكیان بۆ هه‌والی ته‌وابوونی كاره‌كانیان هاتبوون. به بیده‌نگی له شوینی خۆیاندا دانیشتبوون. هیلاكی و ماندووبوونی رۆژگاریان پیوه دیاربوو.

له به‌رپرسی پرسگه‌كه‌م پرسی.

+جه‌نابی وه‌زیر لیره‌یه؟

–به‌لی لیره‌یه، فه‌رموو؟

+زه‌حمه‌ت نه‌بێ ده‌كرێ ئه‌م نامه‌یه‌ی بگاته ده‌ست؟

–به‌سه‌رچاو، به‌ڵام ئیستا له كۆبوونه‌وه‌دایه، باوه‌رناكه‌م به‌م زووانه كۆتایی بێ.

+به‌هه‌رحاڵ من نامه‌كه به‌جێ ده‌هیلم، رۆژی دوو شه‌ممه، دیمه‌وه.

نامه‌كه‌م به‌جێهیشت، بۆ به‌یانی‌یه‌كه‌ی كاك دلشاد عه‌بدوللای شاعیرم ئاگادار كرده‌وه كه نامه‌كه‌م بۆ داناوه‌و رۆژی چوار شه‌ممه ده‌چمه‌وه بۆ وه‌ڵامه‌كه‌ی.

هه‌رچه‌نده پێی ئاسایی بوو، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا وه‌ك ئه‌وه‌ی چاوه‌روانی شتیك بكات به بیده‌نگی پێی گوتم: زۆر باشه رۆژی چوار شه‌ممه.

له ده‌رفه‌تیكدا گه‌رامه‌وه بۆ ژیان و چۆنیه‌تی بیركردنه‌وه‌و ئه‌و رۆژگارانه‌ی "جه‌مال عیرفان"ی تیادا ژیاوه. رۆژگاریك لیوان لیو له ململانێی خیله‌كی و داگیركردن و ده‌سه‌ڵاتی دینی و نه‌خوینده‌واری و هه‌ژاری رۆژگاری پیلانی داگیركردن و تیرۆری فیكرو قه‌له‌م، گه‌رامه‌وه بۆ ئه‌و ساته‌ی كه چ قه‌ده‌ریك و چ چاره‌نووسیك له‌ودیو تیرۆركردنی رۆشنفكریك هه‌بووه؟ له‌به‌ر خۆمه‌وه وتم، هه‌میشه رۆشنفكره‌كان له دوای خۆیانه‌وه پرسیارو گومان به‌جیده‌هیلن، نه‌خوازه تیرۆركردن، له‌سه‌رده‌میكدا كه تریفه‌ی مانگ له ده‌مه‌و ئیواره‌یه‌كدا روناكی به‌ر هه‌یوانی ماله هه‌ژاره‌كانی شار بوو.

له چاوه‌روانی رۆژی چوار شه‌ممه‌دا بووم، تاوه‌كو له نزیكه‌وه ده‌رفه‌تیك وه‌ربگرم، پرسیارو وه‌ڵامه‌كان ئالوگۆر بكه‌ین، له‌لای خۆمه‌وه ده‌مگووت:

ره‌نگه زانیاریه‌كی زۆر كه‌میش سه‌باره‌ت به ژیانی جه‌مال عیرفان كلیلی چه‌ندین ده‌رگای شاراوه و په‌نهان بخاته سه‌رپشت.

جاریكی تر سه‌ردانی پرسگه‌ی وه‌زیرم كرد، له دوای هه‌ندێ پرسیار، ره‌وانه‌ی نووسینگه‌ی تایبه‌تی كردم، زۆری نه‌برد له ریگه‌ی سكرتیره‌كه‌وه بۆ یه‌كه‌مین جار به دیداری كاك شازاد سائیب شاد بووم.

له‌گه‌ڵ چوونه ژووره‌وه‌دا، به‌خیرهاتنیكی گه‌رمی لیكردم و فه‌رمووی دانیشتنی لیكردم، سه‌ره‌تا باسی نامه‌كه‌ی بۆ كردم كه كاك دلشاد بۆی نووسیبوو و خۆشحالی خۆی ده‌ربری كه سه‌باره‌ت به خالی خۆی "جه‌مال عیرفان" گفتوگۆ بكه‌ین، هینده‌ی نه‌برد ده‌رگای ژووره‌كه‌ی كرایه‌وه‌و، "چا" یه‌ك له‌سه‌ر میزه‌كه‌ی به‌رده‌مم به‌هیمنی دانرا. به ده‌م تیكدان "چا"كه‌وه به "مامۆستا"م گوت:

به‌و پییه‌ی نزیكن له "جه‌مال عیرفان"ه‌وه، هه‌لبه‌ت ئاگاداری رووداوه‌كانی ئه‌و رۆژگاره‌ن و "وینه‌كانی و ده‌ستنووسه‌كانی"لاتان ده‌ست ده‌كه‌وێ و پاشان ئه‌و بارودۆخه سیاسی‌یه‌ی تیایدا ژیاوه.

دیاربوو سه‌رقالی كاریك بوو، به‌ده‌م زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌كه‌وه پیی گوتم:



راسته، پرسیاره‌كانیشم خوینده‌وه، من ده‌ستخۆشیتان لیده‌كه‌م، به‌ڵام بابه‌تیكی وا قسه‌وباس زۆر هه‌لده‌گرێ خۆشت ده‌زانی سه‌رقالی كاری ئیمه لیره، ره‌نگه ده‌رفه‌تیكی باشمان بۆ نه‌ره‌خسێ، قسه‌كانی مه‌نتیقی بوون، هه‌ستم به‌وه كرد خه‌لكانیكی زۆر چاوه‌روانی دیتنی وه‌زیرن و چاوه‌روانی راپه‌راندنی كاره‌كانیان. پیم گوت:

زۆر باشه كات و شوینی دیاری كراو لای تۆیه، ئه‌وه‌ی به‌لای منه‌وه گرنگه دیداره‌كه‌یه وینه‌یه‌كی ئه‌رشیفی جه‌مال عیرفانی دایه ده‌ستم، له‌و كاته‌دا بوو له ده‌فته‌ری رۆژه‌كانیا كات و شوینی دیداره‌كه بنووسێ كه رۆژی شه‌ممه (5/26) بوو، میوانیك هاته ژووره‌وه، به زمانی ئینگلیزی به‌خیرهاتنی كردو، باسی هاتنی منی بۆ ئه‌و كرد كه له گۆڤاریك كارده‌كه‌م و هاتووم پرسیاری بنه‌ماله‌كه‌ی به‌تایبه‌تی جه‌مال عیرفانی لی بكه‌م. به‌و ناونیشانه‌ی سه‌ره‌وه به‌ده‌ست و خه‌تی خۆی پارچه وه‌ره‌قه‌كه‌ی دایه ده‌ستم، به زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌كه‌وه ده‌ستی خسته سه‌ر شانم و پیی گوتم.

له كاتی خۆیدا له‌وێ ئاماده‌م، ئاماده‌م هه‌موو هاوكارییه‌كتان بكه‌م. به ده‌م مالئاواییی‌یه‌وه سوپاسم كرد.

نووسینه‌وه‌ی دیداریك له كاتیكدا كه مه‌رگی ناوه‌خته پیش رووداوه‌كان ده‌كه‌ویت، ده‌مباته‌وه بۆ ئه‌و حاله‌ته‌ی كه زۆر جار كرده‌ی نووسین ناتوانێ ئه‌ودیو هیماو ئاماژه‌كانی ژیان بخوینیته‌وه، به تایبه‌تی بۆ مامۆستای شه‌هید شازاد سائیب كه به‌ر له‌وه‌ی له‌سه‌ر شه‌هیدبوونی جه‌مال عیرفان گفتوگۆ بكات، جه‌سته‌و رۆحی ماندوو شه‌هید بوو.

# مافیای سەلەمو سوو!

**حسین نیرگسە جاری**

بۆچوونە ناو مۆدرین‌و نویخوازەکانی (جەمال عیرفان) و (م.نوری) چەند تویژو تاقمیکی نیو کۆمەلیان هەژاندو ئارامیان لی هەلگرتن، ئەو تاقمانە کرین‌و فرۆشتنی توتنیان بۆ خۆیان پاوەن کردبوو، لە زستاندا بە شیوەی (سەلەم) بەرهەمیان بە نرخیکی زۆر کەم لە جوتیاران دەکری، لە وەرزی پیگەیشتنی توتندا (سەلەمدەران) و (سوو-ربا) خۆران پاکی بەرهەمیان دەماشیەوە؛

بگرە زۆر جاریش جوتیاران قەرزار دەبوون‌و کۆمپیالەیان دەخرایە دادگا.

دەبوو بۆ سالی ئاییندە بەمنەت‌و شاباشیکی زۆر ئەم تویژە مشەخۆرە بێ ویژدانە قایل بکرین تا پارەی(سەلەم‌و سوو) بدەنەوە بە جوتیاران بۆ سالی ئایندە، ئەم سیستەمە بۆگەنە هەتا سالانی 957-958یش بەردەوام بوو، خودی خۆم بە هۆی پەیوەندیم بە دەرەوە؛ لە هەموو ئەو کەین‌و بەینانە ئاگادارم.

دیارە ئەو تویژو تاقمانە لەناو کۆمەلدا تانەو تەشەری زۆریان داوە بە تایبەتی لە (جەمال عیرفان) قسەو قسەلۆکیان بۆ هەلبەستوون، بەلگەشم بۆ ئەمە گوتاریکی (رمزی) ناویکە لە ژمارەی (88)دا بە شیوەی سیناریۆ ئەو تانەو تەشەرانە دەگیریتەوە، لە هەمان کاتیشدا مەحکوومیان دەکات، لە کۆتاییدا بە ئایەتیکی قورئان بە جەمال عیرفان دەلێ: پیاوی ژیر ئەبێ تی بگاو ئاگادار بیت.

لە خوارەوە بەشیکی ئەو سیناریۆیە دەخەمە پیش چاو:

بەواسطەی (پیشکەوتن)ەوە بۆ جەمال بەگ عیرفان رەفیقی شەفیقم.. مقالەی ئەخیری توتنتان بیرو وافامی هینامە لەرزین‌و بوو بە سائقی ئەم نووسینە علنیە..

بەلێ ئەم مەحصولە کە واسطەی ژیانی ئیمەیە هیشتا (فکر) ئەعمالی نفووزی تیا نەکردووە؛ هەر بەدەست قەزاو قەدەرەوە ماوەتەوە، لەبەر ئەمەش بووە مەلای باپیرم‌و حاجی باوکم دەوری چەند سالیك دەولەمەندبوون، چەند مالیکیش فەقیرو هەر لە ژیر باری معنوی خراپیدا مل کەچ بوون.

ئیستاش نەسلی حازر (نەوەی نوێ-ح) ئەیانەوێ لەم بیست‌و یەکەمی عصری حازری مەدەنیەتەدا کە فکر قوانینی طەبیعەی ئەسیر کردووە- بە ئیرثی چۆن لە باوك‌و باپیریان هاتونە خوارەوە وا دەوام بکەن. (فاعتبروا یا اولی الالباب).

لەم خصوصەوە ئەولەمین مرتبەی مرشدیتی لایقە بە جەنابت‌و شایانی احترامی ئەی جەمال.

ئینجا ببینەوە سەرو باسی تجارەکان لەسەر ئەو مقالە دووانیان چۆن مباحثە ئەکرد:

ح-حاجی‌و مەلا.

ب-میرزاو سۆفی.

ج-مام ناوەندیکی نەختیك خویندەوار.

ح-تۆ ئەزانی کورەکەی عیرفانە ئەفەندی دەرحەق بە توتن شتیکی زۆر بێ معنای نووسی بوو.

ب-بەلێ لە حوجرەی فلانە کەس ئەیان خویندەوە.

ح-ئەیەویت ماکینەی بۆ بینن‌و بیکەن بە صامسۆن، وەکو جگەرەی ئینگلیزی بیخەنە قوتووەوە.. ئەمە چۆن ئەبیت، عەرەبەکان چۆنمان لی ئەکرن لەم وەختەدا؟

ج-سلاو دەکات‌و دەلێ حاجی ئەوە باسی چی دەکەن- حاجی بە حەقیقەت جمال بەگ فیکریکی باشی نواندنبوو.

ج-رۆلە تۆ تی نەگەیشتووی، ئەو دەورو دەزگایە چۆن دیتە عەمەل.. و ..(بە خلجانیك عصبیەوە قسەی قۆرە).

من ئەو نووسینەی (رمزی) بە تیشکیکی نوێ دەزانم بۆ سەر تاوانی کوشتنی کەلە رۆشنبیرو ئابووریناسی گەلەکەمان (جمال عیرفان)، لە کاتیکدا کە لە میژوو رادەمینم بۆم رۆشن دەبیت کە هۆی سەرەکی جەنگەکان.. چ دەولەتان..چ تاقم‌و چینەکان؛ ئەگەر بە روالەتیش ئاین‌و ئایدۆلۆج‌و.. و بووبن؛ بەلام لە راستیدا جەنگی ململانێی بەرژەوەندی‌و ئابووری بوون.

بە نیازی شارەزابوونی خوینەرانی ئازیز لە کەلتوری ئابووریناسانی کوردستان‌و چیژ وەرگرتن؛ چەند دەقیکی ئەو نووسینانە بە تیکستو ئیملای ئیستا بلاو دەکەمەوە.

*لە (پیشکەوتن)ی ژمارە (87و88)دا بە زنجیرە گوتاریك (شیخ نوری شیخ صالح) دەنووسیت:

ئیمەیش تیجارەتی توتنەکەمان بەناوی شارەکەمان تەنظیم بکەین، هەر کەسێ کە ئیستا توتن دەکرێ؛ یا لەمەودوا متمایلی تجارەتی توتنە؛ شەریکەتیکی عمومیە عەقد بکەن؛ بۆ ئەم شەریکەتە سەنداتی حصە ایجاد بکریت، هەر سەندیك لە طەرەفی کۆمپانیاوە بە (10) لیرە بفرۆشیت. کۆمپانیا لە سلیمانی (مثلا) لە (خانە سووتاودا) مرکەزیکی عمومی ئەبیت.. هەرچی توتن لە محیط و مەملەکەتەکەی خۆمان بچینرێ؛ بە پێی خۆی.. بەولاخی خۆی.. بە دارك بژیراوی‌و پاکو پوختە لە خەراردا بیهینن بۆ (خانە سوتاو)، ئەو وەختە لە طەرەف حکومەتەوە بۆ توتن چ نرخیك برابێ بەو نرخە کۆمپانیا بیکریت.

لە هەمان دوو گوتاردا بە دریژی‌و پسپۆرانە باسی حیساباتی زیان‌و قازانج‌و چۆنیەتی تەسویق‌و دادانی مدیری دەسەلات پیدراو (مدیر مفوض)و..و کردووە.

لە شوینیکی تردا (م.نوری) باسی ئەوە دەکات؛ کە توتن کردن قازانجی بۆ گشت تویژەکانی کۆمەلگا هەیەو دەلیت:

واسیطەی بەخیو کردنمانە توتن، کوا فابریقەمان .. کوا ماکینەمان، ئەوا توتنمان بۆ فرۆشتن نەبوو؛ ئەم هەموو احتیاجەتمان بەچی دەفع ئەبێ؟).

(جەمال عیرفان)یش لە ژمارە (86)ی (پیشکەوتن)دا دا دەنوسیت:

**توتن لە بەغدا نرخی شکاوە**

**غەیری مەکینە چارە نەماوە**

نرخی پیدراوی لە (50)، پاری لە (80)، ئەمسالی (40) سالیکی کە محەقق ئەبێ بە (20 )، ئیمە نرخی تونەکەمان و عارەبەکانیش کلکی حوشترەکەیان.

بۆ ئەم جیهەتە لازمە چارەیەك بدۆزینەوە، چونکە مەداری گوزەرانی ئیمە توتنە، وەلی نیعمەتی بی منەتمان توتنە.. بۆ کرین چیترمان هەیە.. هەر ئەو تالەیە دەیکەین بەشەکرو بە کوتال.

(معلومە مخرجی توتنی ئیمە.. ساحەی فرۆختمان بەغداو عەرەبستانە، ئینجا یان دەبێ دۆعا بکەین لەوێ پارە زۆربێ کە توتنمان بەگران لی بکرن، یان سەبیل کیشی عارەب بەرەکەتیان تێ بکەویت). لە گوتاریکی بە پیزی تریدا پیشنیار دەکات:

1 -توتن کردن کەم بکەین‌و نەوعیەتی باشتر بکەین.

2-ساحەی تیجارەتی فراوانتر بکریت.. لە ئینگلیزەکان داوا دەکات بەشیکی بکرن‌و رەوانەی ئەوروپاو هندستانی بکەن.

(بۆ حصولی ئەم مەقصەدەی ئیمە ئەبی واز لە عەقلی سەقیمی -نەخۆشی- قەدیمی بهینین، نەختێ و سەنعەت بین، زەمانی ئەوە نەماوە هەر لە طەبیعەت ئیستفادە بکریت). بۆ ئەو پرۆژەیە (جمال عیرفان) پیشنیار دەکات:-

1-ماکینەی صاخاخ (رشتە) لازمەو شەرتی اعظەمە، ماکینەی رشتە ( دەشیت مەکینەی تەعلیب بیت-ح) بۆ حەیاتی اقتصادی ئیمە رۆحیکی تازەو بە قیمەت دەبەخشێ.

2-متخصصینی توتن 2-3 سال فیری زراعەتی توتنمان بکەن.

4-قەلمچیەکانیشمان (پارەداران‌و بازرگانان -ح) وەستاو ماکینەی رشتە جەلب بکەن (داوا لە کەرتی تایبەت دەکات کە رۆلی خۆیان ببینن-ح).

لە کۆتاییدا پوختەی داهاتی سالیکی ناوچەکە بە پارە دەخەملینیت‌و لەگەلجگەرەی تورکی‌و ئەوروپی بەراوردیان دەکات.

---

**تیبینی:**

**لە گۆڤاری ئابووری ژمارە (3)ی 1999وەرگیراوە.**